ئەم ڕێچکانە بناسە...

# علمانیەت
# تەبشیر
# بەزیەت



نووسینی: دانا عثمان حسن

# ئەم ڕێچکانە بناسە .......

● علمانیەت

● تەبشـــیر

● بوذیـەت

نووسینی

دانا عثمان حسن

چاپی یەکەم

١٤٢٠ك - ١٩٩٩ز




ناوی کتێب: ئەم ڕێچکانە بناسە...

●علمانیەت ●تەبشیر ●بوذیەت

نووسینی : دانا عثمان حسن

ژمارەی سپاردن : ( ٥٧ ) ساڵی ١٩٩٩زایینی

تیراژ : (٥٠٠) دانە

چاپ :چاپی یەکەم ساڵی ١٩٩٩زایینی



الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على رسولنا وقائدنا محمد وعلى اله الطيبين الطاهرين الى يوم الدين وبعد.

گەر بەخێرایی و وورییای سەیرێکی دنیای ئەمڕۆ خەڵکی ئەم سەر زەویە بکەین ئەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت کەخەڵکی زۆر دورن لەیاسا بڕیار لەسەر دراو نەگۆڕەکانی خوای گەورەو ئیسلام ،؟ تەنها بەشێکی کەم نەبێت لەدانشتوانی سەر زەوی کەبەڕاستی دین داری دەکەن‌و بەتەنها پەروەردگاری خۆیان دەپەرستن‌و دروشمی یەك خواناسی‌و یەکتاپەرستی بەرزدەکەنەوە، لەهەمان کاتیشدا ئەم کۆمەڵە ئیماندارە یەکتاپەرستە لەلایەن دوژمنانی خواو سەرجەم ڕێچکەو بێ‌باوەڕە مادیەکانەوە توشی سزاو ناڕەحەتی دەکرێن‌و ئازار دەدرێن بێ‌ئەوەی تاوانیان هەبێت ، تەنها تاوانیشیان بریتیە لەوەی کەدەڵێن (الله) خوامانەو (ئیسلام) دین‌و بەرنامەی ژیانمانەو (محمد)و هاوەڵانی قدوەو پێشەنگ‌و پێشەوامانەو تەنها ڕازین بەفەرمانی خواو پێغەمبەرو سەرجەم دین‌و ڕێچکە دنیاییەکانی‌تر بەهەڵە دەزانێت ﴿وما نقموا منهم الا أن يؤمنوا بالله العزيز الحميد﴾ هۆکاری سەرەکی بۆ دورکەوتنەوەی خەڵکی لەئیسلام‌و سەرجەم بەها ڕەوشتیەکان لەم سەردەمەدا دەگەڕێتەوە بۆ دروست بونی چەند بەرنامەو یاساو ڕێچکەی دور لەدین‌و دژبەئیسلام ، کەهەر یەکەیان بانگەشە بۆ ڕاستێتی خۆی دەکات‌و لەهەمان کاتیشدا ئیسلام لەبەردەم خەڵکیدا دەکەنە کۆنەپەرستی‌و دواکەوتن‌و....))

هەر بۆیە لەم کاتەدا بەپێویستم زانی لەم نامیلکەیەدا کەلەبەردەستی خوێنەرانی بەڕێزدا دەخوێنرێتەوە چەند ڕێچکەو بیروباوەڕێکی نادروست باس بکەم کەخەڵکێکی زۆریان هەڵخەڵەتاندوەو لەئیسلامیان دورخستونەتەوە ، کەبریتین لەهەر سێ ڕێچکەی (علمانی ، تەبشیر ، بوژی). بەکۆمەکی پەروەردگار هەریەك لەم ڕێچکە بێ‌دینانە لەسەرەباسێکی چڕوپڕو سەربەخۆدا باسیان لێوە دەکرێت‌و حەقیقەتیان دەخرێتە بەردیدەی خوێنەرانی تالە ڕوانگەی ئیسلامەوەو لە نزیکەوە هەریەکەیان بناسین‌و بەپێوەرە خواییەکان لەتەرازووی ژیری‌و ڕەوشت‌و ئیمان‌و فطرەتدا هەڵیان بسەنگێنێت.

((اللهم اجعل عملي كله صالحاً واجعله كله خالصا لوجهك الكريم))

﴿ان الدين عندالله الاسلام﴾

سلێمانی / محرم / ١٤١٩ك - ١٤ / ٥ / ١٩٩٨ز

# بەندی یەکەم

## علمانیەت

## Secularism

پێناسەی علمانیــەت : ((دائیرەی مەعافی بەریتانی لەپێناسەی ووشەی علمانیەتدا (سیکۆلارزم Secularism) دەڵێ: (هی حرکة اجتماعیة تهدف الی صرف الناس عن الاهتمام بالاخرة الی الاهتمام بالحیاة الدنیا وحدها....)[1]

واتــە: بریتیــە لــەو جوولــە کۆمەڵایەتی یــەی کەمەبەســتی ســەرەکی بریتیــە لەدورخستنەوەو پچڕاندنی خەڵکی لەبایەخ دانیان بەڕۆژی دوایی و مەشغوڵ کردنیان تەنها بەژیانی دنیا))

یان((اللادنیة او الدنیویة، وهی دعوة الی اقامة الحیاة علی غیر الدین))[2]

واتە: مەبەست لەعلمانیەت بریتی یە لەبێدینی و دنیا پەرستی، هەروەها علمانیەت بریتیە لەو بانگەوازەی کەهەوڵ دەدات بۆ دامەزراندن و پێکهێنانی ژیانی ئینسانەکان لەسەر بناغەی بێدینی.

یان ((وهی دعوة الی الدین بعیداً عن مناهج الحیاة ونظمیها، وفصل الدین عن السیاسة والحکم))[3]

واتە/ بریتیە لەو بانگەوازەی کەهەوڵ دەدات بۆ مەبەستی دورخستنەوەی دین لەبەرنامەی ژیانی مرۆڤ و دورخستنەوەو جیاکردنەوەی دین لەسیاسەتی وڵات و حوکم ڕانی))

پرسیار: ئایا ووشەی علمانیەت لەچیەوە هاتووە؟!

وەڵام : بێگومان ووشەی علمانیــەت ووشــەیەکی تەرجەمەکراوە بــۆ ســەر زمانی عەرەبی و لەووشەی ((Secularism)ی ئەوروپی وەرگیراوە)[4]

---

(١) مذاهب فکریة معاصرة (محمد قطب) ص (٤٤٥)، الاسلام والعلمانیة وجهاً لوجهه

(٢) الموسوعة المیسرة فی الادیان والمذاهب المعاصرة (ص ٣٦٧)

(٣) الجداول الجامعة في العلوم النافعة (فصل الفرق والملل) الشیخ جاسم بن محمد ص ٣٦٢.

(٤) مذاهب فکریة معاصرة (محمد قطب) (ص : ٤٤٥).

هەندێك كەسی ناحاڵی وا لە ووشەی (علمانیەت) تێگەیەنراوە كە(علمانیەت) واتە(زانستو علمو بەرەو پێش چوونی زانیاری) بەڵام لەڕاستیدا وانیە بەڵكو ئەم جۆرە تێگەیشتنە بۆ مەبەستی گومڕاكردنو چاوبەست كردنی خەڵكی بڵاوكرایەوە تاخەڵكی لەحەقیقەتی ئەم ڕێچكە بێدینە تێنەگەنو بەئاسانی شوێنی بكەونو بیكەنە بەرنامەی ژیانی خۆیان، كەواتە بەشێوەیەكی گشتی علمانیەت بریتیە لەو ڕێچكە بێدینەی كەكاردەكات بۆمەبەستی دورخستنەوەو جیاكردنەوەی دین بەگشتیو ئیسلام بەتایبەتی لەژیانی ئینسانو سیاسەتو دەوڵەت داریو هەڵبژاردنی ژیانی دنیا لەسەر بناغەی بێدینیو عەشوایی، هەروەها وەك وتمان علمانیەت هیچ پەیوەندی بە(علم)ەوە نیەو تەنها هۆكاریش بۆ تێكەیاندنی خەڵكی لەم زاراوەیە بەووشەی (علم) گومڕاكردنو چاوبەست كردنیانە.

## سەرەتای سەرهەڵدانی علمانیەت لەوولاتانی ڕۆژئاودا

بێگومان سەرەتای سەرهەڵدانی بیرۆكەی علمانیەت دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەكانی (١٧٨٩)ی زاینی كەشۆڕشی فەرەنسای تێدابەرپادبوو لەوبەكەم شوێنیش كەئەم بیرۆكەیەی تێدابڵاوبویەوە (ئەورووپابوو)[1] پاشان بەوولاتانی تری جیهاندا بڵاوبویەوە.

## هۆكاری سەرهەڵدانی علمانیەت لەوولاتانی ڕۆژئاوادا

هۆكاری سەرهەڵدانی علمانیەت لەوولاتانی ئەورووپادا دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆكارێكی (دینیو دەروونیو مێژوویو واقعی كەپەیوەست بوو بەوولاتانی ڕۆژئاوای ئەو سەردەمەوە، كەگەورەترین هۆكاریان بریتیبوو لەهۆكارە دینیەكە ئەویش بەهۆی خراپ ڕەفتاركردنی پیاوانی كەنیسە كەخۆیان بەشوێن كەوتەی عیسا پێغەمبەر دەزانی (علیه السلام) لەگەڵ خەڵكی ئەورووپادا كەغەدرو كاری فێڵ بازیان لەگەڵ خەڵكی ئەوكاتەدا ئەنجام دەداو هەر جوڵەیەكی زانستی لەسەردەمی قەشەكانی ئەورووپادا سەری هەڵبدایا ئەوە دەست بەجێ سەركوتیان دەكردەوەو دژی دەوەستان، هەربۆیە پیاوانی بەناو دینو چاكە خوازی كەنیسەبوونە ستەم كارو چەوسێنەرەوەی هەژارانو پاڵپشت بۆ دەستەڵات دارو سەرمایەدارەكانی ئەو سەردەمە، هەروەها كارگەیشتە ئەوەی كەپیاوانی كەنیسە

(١) الموسوعة الميسرة في الاديان والمذاهب المعاصرة (ص ٣٦٨).

بەهەشتو دۆزەخیان بەخەڵك دەفرۆشتو سەدانو هەزاران بیروباوەڕی نادروستو خەرافیو دوور لەژیرو زانستی لەسەردەمی قەشەو پیاوانی کەنیسەدا بەناوی دینەوە بلاّوبوبیەوە.

لەم کاتەدا خەڵکی ئەورووپا بەگشتیو وولاّتی فەرەنسا بەتایبەتی هەڵسا بەبەرپاکردنی شۆڕشێك لەساڵی (١٧٨٩) کەبە (شۆڕشی فەرەنسی بەناوبانگەو یەکەم وولاّت بوو لەئەورووپادا کەبانگەشەی بێدینیو سەربەخۆیی خۆی کردو دەستوورو یاسای نوێی بۆ وولاّت دامەزراندنو بەناوی گەلەوە فەرمان ڕەوای خەڵکی فەرەنسای کرد، ئەمیش ڕێخۆش کەرێکی گەورەبوو بۆ هاتنە مەیدانی سەرجەم ڕێچکە بێدینو ئیلحادیەکانی وەك (مارکسیەت لەئەڵمانو ڕوسو بلاّوبونەوەی بیردۆزی داروینو فرۆید) لەوولاّتەکانی تری ئەورووپادا، کەسەرەکیترین هۆکار بۆ ناشرینبوونی دینو ئەمانی متمانە بەسەرجەم دینە ئاسمانیەکان بریتیبوو لەو کارە دزێوو نامرۆڤانەی کەپیاوانی کەنیسە بەناوی دینەوە ئەنجامیان دەدا لەئەورووپادا.

بەڵێ علمانیەت بیانوی واقعی هەبوو بۆ مەبەستی دەرکەوتنی لەوولاّتانی ئەورووپا لەبەرئەم خالاّنەی خوارەوە:

١- مەسیحیەت ڕازیبوو بەجیاکرنەوەی دین لەدەوڵەت چونکە هەندێ لەیاسا بڕیار لەسەردراوەکانی ئینجیلی دەست کاری کراو باس لەم خاڵە دەکاتو بەشێوەیەکی ئاشکرا دەڵێ ((اعط ما لقیصر لقیصر، وما لله لله)).

ما لقیصر لقیصر :واتە : بەخشینی دەستەلاّتو فەرمان ڕەوایو سیاسەت بەدەستەلاّت دارانی وولاّت(جا هەرکەسێکە) هەروەها مل کەچ کردن بۆی لەهەموو سەردەمو کاتێکدا.

ما لله لله :واتە : بەخشینی دەستەلاّتو مل کەچ کردن بەقەشەی کەنیسەو ڕازی بوون بەهەموو بڕیارەکانیان.

بەڕاستی ئەم دەقەی کەلەئینجیلدا هاتووە گەورەترین بەڵگەو هاندەرە بۆ جیاکردنەوەی دین لەدەوڵەت لەئەورووپادا چونکە دینی مەسیحیەت خۆی بانگەشەی بۆ ئەم جیابونەوەیە دەکردوو هاندەری سەرەکیبوو بۆ دورکەوتنەوەی دین لەدەوڵەتو سیاسەتو فەرمان ڕەوایو بەخشینی بەعلمانیەکان.

بەلاّم بەپێچەوانەوە ئیسلام لەسەرجەم دەقە شەرعیو بڕیارەکانیدا زۆر بەتوندی دژی ئەم بڕیارەیە کەدین لەدەوڵەت جیابکرێتەوەو خەڵکی مل کەچی هەموو فەرمان

ڕەوایەك ببێت و تەنها لەقاڵبی تاکە کەسیدا بمێنێتەوە، قورئان دەفەرموێت: ﴿ان الحکم الا لله﴾ واتە : کاری بەڕێوەبردن و فەرمان ڕەوای تەنها بۆ پەروەردگارە، بەم شێوەیە:

(أ) بەڕێوەبردنی زەوی و دابین کردنی ڕسق و ئاوو هەواو پێداویستیەکان بۆ مرۆڤ و هەروەها بەڕێوەبردنی بونەوەرو جیاوازی ئاوهەواو وەرزەکانی ساڵ و شەوڕۆژوو سەرجەم دیاردەکانی تری بونەوەر تەنها دەستەڵاتی پەروەردگارەو کەس تێیدا بەشدارنیە.

(ب) بەڕێوەبردنی ژیانی خەڵکیش لەڕوی بەرنامە دانانەوە تەنها کاری پەروەردگارەو نابێت کەس بەشداربێت.

هەروەها دەفەرمێت: ﴿ومن لم یحکم بما أنزل الله فأولئك هم الکافرون﴾.

واتە : هەرکەسێ لەکاتی دەستەڵات داریتیدا کاری بەوە نەکرد کەخوای گەورە دای بەزاندوە کە . قورئانە . ئەوە بێباوەڕە!!

یان پێغەمبەر دەفەرموێت ((لا طاعة لمخلوق فی معصیة الخالق))[1]

واتە : بەندە نابێت گوێڕایەڵی بۆ بەندەیەکی تر بکات لەکاتێکدا کەفەرمانی کارێکی پێدەکات کەسەرپێچی خوای گەورەی تێدابێت.

هەروەها ئێمەی موسڵمان خاوەنی عەقیدەیەکین کەبوارمان نادات و ڕازی نیە بەوەی کەگوێڕایەڵی تەنها فەرمانێك بکەین کەدژی یاساکانی ئیسلام بێت ، وە هەرکەسێکیش ڕازی بوو بەحوکمی غەیری خوا ئەوە لەپێوەری ئیسلامیدا بە(بێباوەڕو ستەم کارو فاسق) لەقەڵەم دەدرێت.

٢ – مەسیحیەت خاوەنی ئەو بەرنامە فراوانە نیە کەهەموو لایەنەکانی ژیانی ئینسانی گرتبێتەوە، بێگومان گەر کەمێك شارەزایی مان هەبێت دەربارەی دینی دەست کاری کراوی مەسیحیەت ئەوە لەو ڕاستیە تێدەگەین کەیەکێکی تر لەو هۆکارانەی کەیارمەتی دەرێکی گەورەی هاتنە مەیدانی علمانیەت بوو لەووڵاتانی ڕۆژئاوادا بریتی بوو لەوەی کەمەسیحیەت لەو سەردەمەدا تەنها لەچوارچێوەی کەنیسەدا کاری دەکردوو سەرجەم لایەنەکانی تری ژیانی ئەورووپی بەردابوو هەر لەکێشە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و سەربازی و دەرەکی و ناوەکیەکان.

---

(١) متفق علیه.

لەڕاستیدا مەسیحیەت لەو سەردەمەدا تەنها خۆی لەبواری ڕۆحانیەت و ژیانی گۆشەگیریدا دەبینی و بەرنامەیەکی وابەرفراوانی پێنەبوو بۆ چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی و توانای وەڵام دانەوەی سەرجەم پرسیارەکانی خەڵکی نەبوون ، لەم کاتەدا بۆشای و کەلەبەرێکی زۆر گەورە کەوتە ژیانی خەڵکی ڕۆژئاواوەو بۆماوەیەك بەم نەخۆشیەوە مانەوە ، بەڵام لەپاش ماوەیەك علمانیەت وەك بەدیلێك بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کەپیاوانی کەنیسە بۆ خەڵکیان دروست کردبوو هاتنە مەیدانی عەمەلی و سەرساحەی ژیانی خەڵکی، هەر بۆیە خەڵکی بەوشێوەیە بارەشی بۆکردنەوەو ئامادەبوون لەپێناو پاراستنی ئەو قەوارە علمانیەدا خۆیان بەخت بکەن و قوربانی بدەن بەمەرجێ پیاوانی کەنیسەو قەشە مەسیحیەکان فەرمان ڕەوایان نەبن!!

بەڵام ئیسلام لەم خاڵەشدا دوورە لەوەی کەبەرنامەیەکی بەرفراوان و شاملی پێنەبێت بۆ خەڵکی، بەڕاستی کاتێ ئەم حەقیقەتەمان بۆ دەردەکەوێت کەلەسەرجەم یاسا قورئانی و فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) تێبگەین.

قورئان وەك بەرنامەیەکی بەرفراوان و کامڵ دەفەرموێت:

﴿ولقد صرفنا في هذا القران للناس من كل مثل وكان الانسان اكثر شئ جدلاً﴾ ( الكهف: ٥٠)

واتە: هەموو ئەو شتانەی کەئینسان کاری تێی دەکەوێت لەژیانیدا لەقورئاندا باسمان کردووە، بەڵام ئینسان لەزۆربەی کارەکاندا موجادەلە دەکات. یان دەفەرموێت:

﴿ونزلنا عليك الكتاب تبياناً لكل شئ وهدى ورحمة وبشرى للمسلمين﴾ (النحل:٨٩)

واتە: ئەی محمد (ﷺ) کتێبێکمان بۆ ناردویتە خوارەوە کەقورئانە. لەبارەی هەموو شتێکەوە ڕون کردنەوەی خۆی دەربڕیووە هەروەها ئەم قورئانە هەڵگری سیفەتی ڕێنموییکردن و ڕەحمەت و مژدەی تێدایە بۆ موسڵمانان.

بەڵێ ڕاستیەکی بەڵگە نەویستە کەقورئان هەموو لایەنەکانی ژیانی ئینسانی تێدا باس کرابێت و تەنها لایەنێکی ئینسانی بیرنەکردبێت، ئەویش بەهۆی ئەوەی ئیسلام دواخەڵاتی ئاسمانی پەروەردگارەو لەدوای ئیسلام نیگای خوای و پێغەمبەر ڕەوانە ناکرێت، کەواتە دەبێت قورئان سەرجەم لایەنەکانی ژیانی ئینسانی تێدابێت و تەنها لایەنێك نەمابێت کەباسی نەکردبێت، عیسی (علیه السلام) خوای گەورە ناردی بۆ گەلی بەنی ئیسرائیل و دواپێغەمبەری ئەو گەلەبوو لەدوای موسا (علیه السلام) هەروەها پەرتوکێکی شی بەناوی (ئینجیلەوە) پێبەخشرا بەڵام ئینجیل تەنها پەیوەست بووبەو گەلەوە لەهەمان کاتیشدا تەواوکەری شەریعەتی موسا بوو (علیه السلام).

جێگەی خۆیەتی کەئینجیل هەموو لایەنەکانی ژیانی ئینسانی باس نەکردبێ چونکە بۆ گەلێکی تایبەتو کاتێکی تایبەت هات، بەڵام ئیسلام بەپێچەوانەوە بۆ سەرجەم ئادەمیزادەکانە تاڕۆژی دوایی ﴿ان هو الا ذکر للعالمین﴾

ئیسلام لەهەموو بوارەکانی ژیانی ئینسان یاساو دەستوری تایبەتی خۆی داناوە. بەوپەڕی گونجان لەگەڵ هەموو کاتو سەردەمێکدا هەر لەبوارەکانی:

(أ) بواری عەقلی: بێگومان ئیسلام وەك دینێکی خوایی ڕێزێکی زۆری لەژیری ئینسانەکان گرتووەو ژیری ئینسانەکانی کردۆتە پێوەرێك بۆ تێگەیشتن لەیاساکانی خۆی واتە (ئیسلام).

هەروەها بەهۆی ژیریەوەکە زۆرێك لەشتە نادیارە غەریبەکان دەدۆزینەوەو باوەڕیان پێدەکرێت هەر لەبونی خواو ڕۆژی دوایو بونی مەلائیکەتو بەهەشتو دۆزەخ، هەروەها تەکلیفو سزا خواییەکان بەسەر ئینسانی خاوەن ژیریدایە نەك بەسەر کەسانێکدا کەنعمەتی ژیریان لێسەنراوەو دەرك بەچاكو خراپو دۆستو دوژمنی خۆیان ناکەن.

ئەوەندە بەسە کەزۆرجار لەقورئاندا خوای گەورە سەرجەم مرۆڤەکان بەباس کردنی وشەی )عەقل) ڕادەچڵەکێنێو دەفەرموێت: ﴿لعلکم تعقلون﴾ ﴿عبرة لاولی الالباب﴾ واتە: (خاوەن ژیریەکان).

(ب) ئیسلام خەڵکی هان دەدات لەسەر داهێنانو کاری تازەگەری نەك شوێن کەوتنی کۆنانەو کاری لاسایی کردنەوە؛ بێگومان ئیسلام هاندەرێکی سەرەکیو پاڵ پێوەنەری مرۆڤەکانە لەبواری بەکارهێنانی ژیریانو داهێنانو ڕادەربڕینو اجتهادکردن لەهەموو ئەو کێشەو گرفتانەی کەلەو سەردەمو کاتەدا توشی خەڵکی دەبێت، ئیسلام نەك هەر کاری تازەگەریو اجتهادی بەلاوە پەسەندە بەڵکو هانیشمان دەدات لەسەر گەیشتن بەو کارە، هەربۆیە دەرگای اجتهادو تازەگەری لەهەموو سەدەو سەردەمێکدا لەسەر پشت بووەو پێغەمبەریش مژدەی داوە بەوکەسانەی کە اجتهاد دەکەن بەوەی کەدەفەرموێت: (ئەو کەسەی کەموجتەهیدە دوو پاداشتی هەیە لەکاتێکدا ڕاستیکرد، خۆئەگەر هەڵەشیکرد ئەوە یەك پاداشتی هەیە چونکە خۆی ماندوکردووە) بەڵێ لەهەمان کاتیشدا دژی لاسایکردنەوەو تەقلیدی کۆنانەیە، هەر بۆیە قورئان زۆر بەتوندی هێرش دەکاتە سەر بێباوەڕەکانی سەردەمی پێغەمبەر دەفەرموێت:

﴿واذا قیل لهم اتبعوا ماانزل الله قالوا بل نتبع ما الفینا علیه أباءنا او لو کان اباءهم لایعقلون شیئاولایهتدون؟!﴾ (البقرة: ١٧٠)

(ج) ئیسلام دینێکی واقعیە : ئیسلام زۆر پێچەوانەی مەسیحیەتە چونکە مەسیحیەکان تەنها بایەخ دەدەن بەلایەنی ڕۆحی و ژیانی گۆشەگیری و وازهێنان لەدنیاو خۆشیەکانی، بەڵام ئیسلام بەشێوەیەکی واقعی و دور لەهەموو بیروباوەڕێکی خەرافی و دور لەژێریەو دەروانێتە مرۆڤەکانی وەك ئینسان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات نەك وەك (جنۆکەو مەلائیکەت) بەڵکو ئیسلام وادەدوێ دەربارەی مرۆڤ کەڕاست دەکات و هەڵەش دەکات و ڕۆدەچێ و ڕاست دەڕواو هەروەها لەبارەی ژیانیشەوە ئیسلام بەشێوەیەکی زۆر واقعی لەژیان دەکۆڵێتەوەو ئاگاداریان دەکات کەدنیا کێڵگەی دواڕۆژەو ئینسان بەسەرجەم ئامانج و مەبەستەکانی خۆی ناگات لەدنیادا، بەڵکو لەدواڕۆژدا بەسەرجەم داواکاریەکانی دەگات گەر لەدنیادا خواپەرست بووبێت.

(د) ئیسلام دینی زانستە (علم): هەروەها یەکێکی تر لەو خاڵانەی کەئیسلام ی وەك دینێکی ئاسمانی و خەڵاتێکی خوای پێجیادەکاتەوە لەدینی مەسیحی بریتیە لەوەی کەئیسلام بایەخێکی تەواوی داوە بەبواری زانست و دەفەرموێت:﴿قل هل يستوى الذين يعلمون والذين لايعلمون!؟﴾

بێگومان نەخێر، قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر گەورەترین زانستی تێدایە کەلێرەدا بواری باس کردنیان نیە.

بەڵام بەپێچەوانەوە مەسیحیەت و عیلم زۆر دورن لەیەکەوە چونکە قەشەکان گەورەترین بەربەست بوون بۆ بەرپەرچ دانەوەی هەموو ئەو زانستانەی کەلەسەدەکانی (١٧)و دواتردا پەخش دەکرا، تاکار گەیشتە کوشتنی زاناکان و لەسەرو هەموشیانەوە (گالیلو) کەزانایەك بوو بەدەست ی قەشەکان کوژرا بەتۆمەتی ئەوەی کەوتی زەوی خڕە!!

(ه) ئیسلام دینی دنیاو پاشەڕۆژە : گەورەترین هۆکار بۆ سەرهەڵدانی ڕێچکە مادیەکان بەگشتی و علمانیەت بەتایبەتی بریتی بوو لەوەی کەقەشەکان دەستیان دابوویە گۆشەگیری و ڕەهبانیەت و لەسەر ڕێ ڕەوی پێشینانی خۆیان دەڕۆیشتن کە قورئان لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿ورهبانية ابتدعوها ماكتبناها عليهم﴾ ...واتە : گاورەکان هەڵسابوون ژیانی گۆشەگیریان بۆ خۆیان هەڵبژاردبوو و فەرزیان کردبوو لەسەرخۆیان بێئەوەی لەسەریان فەرزبکرێت و داوایان لێبکرێت ، بەڵێ ئەمە حاڵ و تێگەیشتنی قەشەکان بوو دەربارەی دنیاو دواڕۆژ کەوایان حساب دەکرد هەتا پیس و پۆخڵ و چڵکن بێت وزیاتر گۆشەگیربیت و واز لەژیانی دنیاو خۆشیەکانی بهێنن ئەوە زیاتر لەخوای گەورە نزیك دەبیتەوەو پلەی بەرزترت هەیە لەبەهەشتدا. هەربۆیە لەیەکێ لەبڕگەکانی (ئینجیلدا) هاتووە دەڵێ:

((من طلب الفردوس فخبز الشعير ونام مع الكلاب في المذابل))[1]

واتە: هەركەسێ خوازیارەكە بچێتە ناو بەهەشتو فیردەوسی بەنسیب ببێت ئەوە نانی جۆ بخواتو شەوانیش لەكاتی خەودا لەگەڵ سەگدا بنوێت لەو جێگایانەدا كەخۆڵو پیسی لێخڕدەكرێتەوە.

بەڵێ ئەوە بۆچوونو تێگەیشتنی پاپاكانی كەنیسەبوو دەربارەی دینو دنیا. بەڵام ئیسلام زۆر بەپێچەوانەوە دەربارەی دنیاو پاشەڕۆژی مرۆڤەكان دەدوێو تەوازنو یەكسانی لەنێوان ژیانی دنیاو هەوڵ دان بۆ پاشەڕۆژ دروست دەكاتو دەفەرموێت: ﴿وما الحياة الدنيا إلا متاع الغرور﴾ یان ﴿وما الحياة الدنيا الا قليل﴾ ..واتە : بەڕاستی ژیانی دنیا خۆشیەكی گومڕاكەرەو خوات بیردەباتەوە یان ژیانی دنیا لەچاو دواڕۆژدا زۆر كەمە.

بەڵام بۆ هاوسەنگ كردنەوەی ئەم لایەنە دەفەرمێت:﴿ولا تنس نصيبك من الدنيا﴾ ..واتە : ئەوبەشەی كەخوای گەورە بۆی داناویت لەدنیادا پشت گوێی مەخەو هەوڵ بدە بۆ بەدەست خستنی.

٣ - مێژووی كەنیسە غەیری مێژووی ئیسلامەو جیاوازیەكی زۆری هەیە: یەكێكی تر لەو هۆكارانەی كەبووە ڕێخۆش كەرێك بۆ دروست بوونو هاتنە مەیدانی ڕێچكەی علمانی لەووڵاتانی ڕۆژئاوادا بریتیبوو لەو مێژووە ڕەشو پڕتاوانەی كەنیسەی گاورەكان كەبەسەریان بردبوو لەگەڵ ئەو خەڵكەی كەمامەڵەیان دەكرد لەگەڵیاندا، بەڕاستی مێژوویەكی ترسناكو خوێناویو پڕ تاوانو تۆقاندن بوو بەچەند شتانێكی خەیاڵیو دور لەڕاستیەوە بەرپەرچی بۆچوونو فكری خەڵكیان دەدایەوەو بەسەركوت كردنو گرتنو بەندكردن بەرپەرچی ئازادیو سەربەستیان دەدایەوەو بەنەفامیو سەرجەم بیروباوەڕە خەرافیەكان وەڵامی جوڵە زانستیەكانیان دەدایەوە.....))[2]

مێژووی كەنیسە لەگوێی ئینسانە ڕۆژئاواییەكان مانای داگیركردنو كوشتنو سەربڕینو تۆقاندنی بەردەوام دەگەیەنێت.

هەر بۆیە بەشاهدی پیاوێكی وەك ((امري ريفز) لەكتێبی (تحليل السلام)دا باسی هۆكارەكانی فەشەلی مەسیحیەت دەكاتو دەڵێ: (ان القتل الواسع النطاق والتعذيب،

---

(١) الانسان بين المادية والاسلام (تاليف محمد قطب))

(٢) الاسلام والعلمانية وجهاً لوجه (دكتور يوسف القرضاوي) ص (٥٧)

والاضطهاد، والضغوط التي شهدنا في منتصف القرن العشرين، لادلة قاطعة على الافلاس الكامل للمسيحية )[1]

واتە: ئەو کوشتنە بەرفراوانو ئازارو داگیکردنو پاڵەپەستۆیەی کەلەسەدەکانی ناوەڕاستی چەرخی بیستەمدا لەلایەن مەسیحیەکانەوە ئەنجام درا، بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر هیچ پێنەمانو لەناوچونی بەیەك جارەکی مەسیحیەت ، بەڵێ بەکورتی ئەمە مێژووی پڕلەتاوانو کارەساتی گاورەکان بوو کەبەناوی دینەوە لەڕۆژئاوادا ئەنجامیان دەدا!! ئاخۆ دەبێت لەکۆمەڵگاو کاتێکی ئاوادا خەڵکی چ باوەڕو متمانەو ئومێدێکی بەدین بمێنێ؟! ئاخۆ دەبێت خەڵکی لەستەمو زۆری ئەم گاورە مەسیحیەیانە ڕاوبۆچون و باوەڕی چی بەسەربێت بەرامبەر پەروەردگارو دینە ئاسمانیەکانی‌تر؟!.......

بێگومان ئەم پرسیارەو سەدان پرسیاری تری لەم جۆرە ئەمە وەڵامەکەیەتی کەبڵێین: ((بەرپەرچ دانەوەی سەرجەم دینە ئاسمانیەکانو فڕێدانیانو باوەڕنەکردن بەسەرجەم لایەنە نادیارەکانی کەبەئەودیو سروشت ناسراون (میتافیزیکا)و هەروەها نەبڕکردنو متمانەکردن بەهەموو ئەو کەسانەی کەدژی ئەم فەرمان ڕەوا گاورە مەسیحیانە دەوەستێ، بەڵێ علمانیەت ئاواو بەم شێوەیە لەووڵاتانی ڕۆژئاوادا ڕەگی داکوتاو بوبە (بەدیلێکی زۆر دروست بۆ گاورەکان) )).

بەڵام ئایا مێژووی ئیسلامیش هەروایە؟! ئایا دەگونجێ بڵێین مێژووی ئیسلامیش هەروەك مێژووی مەسیحی وەهایە؟! بێگومان مێژووی ئیسلامی خۆی وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوە بەووشەی ((نەخێر))، *مێژووی ئیسلامیو ڕوداوەکانی لەگەڵ مێژووی مەسیحیو ڕوداوەکانیدا وەك زەوی ئاسمان دوورن لەیەکترەوە چونکە:*

(أ) لەسەردەمی دەستەڵاتی مەسیحیە گاورەکاندا زانستو زانست خوازان بەوپەڕی توندوتیژیو تۆقاندن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکراو سەرکوت دەکرانەوە بەڵام لەسەردەمی دەستەڵاتی ئیسلامیداو لەسەدەکانی ناوەڕاستدا موسڵمانان خۆیان پێشەنگو پێشەوای سەرجەم ڕەوتە زانستیەکان بوونو تاکە کۆمەڵ بوون لەجیهاندا لەبواری زانستو هونەرو فەلسەفەو.. هتد)) هەروەك مێژوو نوسێکی وەك (سیدیۆ) لەکتێبی (تاریخ العرب)دا دەڵێت: ((كان المسلمون في القرون الوسطى متفردين في العلم والفلسفة والفنون وقد

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

نشروها اينما حلت اقدامهم وتسربت عنهم الى أوروبا فكانوا هم سببا لنهضتها وارتقائها))[1]

واتە: ((موسڵمانان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا تاکە کەس بوون لەزانستو فەلسەفەو هونەردا، هەروەها موسڵمانەکان هەڵسان بەگەیاندنی ئەم زانستەو فەلسەفەو هونەرە بەهەموو ئەو جێگایانەی کەپێیان تێ دەچوو، ئەم زانستە بەرەو ئەوروپا کەوتەڕێو موسڵمانەکان بونە هۆکاری سەرەکی ڕاپەڕاندنو بەرزکردنەوەی ئاستی زانستیو فەلسەفیو هونەری ئەوروپاییەکان)).

(ب) لەسەردەمی جێگیربوونو فەرمان ڕەوای گاورە مەسیحیەکاندا سەربەخۆیو ئازادیو مافە ڕەواکانی خەڵکی بەئاشکرا پێشێل دەکرانو سەرکوت دەکران، هەربۆیە ئەو جولەکانەی کەلەووڵاتە مەسیحیەکان جێگیربوون دەرکرانو بێچارەمانەوەو هیچ دەوڵەتێکیش متمانەی بەجولەکە نەدەکرد کەلەووڵاتی خۆیدا جێیان بۆ بکاتەوە چونکە خەڵکی ئەو سەردەمە جولەکەیان باش دەناسی کەچەندە ئاژاوەچیو خیانەت کارن، هەربۆیە تاکە ووڵاتێك لەجیهانی ئەو سەردەمەدا کەجێی بۆجولەکە کردەوەو پەنای دا موسڵمانان بوو لەووڵاتی (ئەندەلوس) کە (ئیسپانیا)ی ئێستا دەکات.

کەئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ستەمی گاورەکانو لێبوردنو دڵ فراوانیو پێبەخشینی ئەوپەڕی ئازادی لەلایەن موسڵمانەکانەوە))[2]

بەڵێ ئەمە بەراوردێکی خێراو کەم بوو لەنێوان مێژووی ئیسلامو مێژووی مەسیحیە خاچ پەرستەکانەوە، کوردیش لەمێژەوە ووتویانە مشتێك نمونەی خەروارێکە.

## فەشەلی علمانیەت لەووڵاتانی ئیسلامیدا

گەر ئەوەی باسمان کرد لەخراپی مامەڵەکردنی مەسیحیەکانو تایبەت مەندیەکانی دینی دەستکاری کراوی مەسیحیەتو کوشتنو تۆقاندنی خەڵکیو بلاوکردنەوەی بیروباوەڕی خەیاڵیو ڕاوەستان دژی زانستو مافەکانی خەڵکیو دابەش کردنی کارتی بەهەشتو دۆزەخ بەسەر خەڵکیو هاندانی خەڵکی بە مل کەچ بونیان بەرامبەر هەر فەرمان ڕەوایەك کەفەرمان دەکات ((اعط مالقيصر لقيصر))و چەندین ڕوداویتری لەم

---

(١) روح الدين الاسلامي (عفيف عبدالفتاح طبارة) ص (٢٨٧)

(٢) رؤية اسلامية لاحوال عالم المعاصر (محمد قطب)

جۆرە بێت ئەوە هەرگیز ڕاست‌و دروست نیە کە علمانیەت لەووڵاتانی ئیسلامی بەرقەرابێت‌و بە ئەنجامی کۆتای بگات، چونکە لەوەوپێش باسمان کرد کەگەورەترین هۆکار بۆ دروست بون‌و سەرهەڵدانی علمانیەت لەوڵاتانی ڕۆژئاوادا بریتی‌بوو لەکاری گەری خراپە مامەڵەکردنی قەشە گاورە مەسیحیەکانی ئەورووپاو مێژووە ترسناک‌و ڕەشەکەیان ، بەڵام نەئیسلام ئەو مێژووە ڕەشەی تۆمار کردووە وەك مەسیحیەت و نەلەسەردەمی دەستەلاتیشیدا دژی خەڵك‌و پێشکەوتن‌و پێشکەوتنە زانستیەکان وەستاوە، *کەواتە بەپێی ئەم یاسایەی سەرەوە سەرهەڵدان‌و دروست بوونی علمانیەت لەووڵاتانی ئیسلامی هیچ بەڵگەیەکی پێ‌نیە چونکە:*

١) علمانیەت بەتەبیعی حاڵ دژایەتی لەگەڵ یاساکانی ئیسلامیدا هەیە کەئیسلام دینی ڕاست‌و پێشەنگی ئەو گەلە موسڵمانەیە کەعلمانیەت بەحسابی خۆی تێیدا دروست‌و جێگیربووە.

٢) هەروەها علمانیەت دژایەتیەکی زۆری هەیە لەگەڵ سەرجەم ڕەوشت‌و تێگەیشتنە ئیسلامیەکاندا. لەبەرئەوە علمانیەت هیچ بیانویەکی ڕاستی بەدەستەوە نیە بۆ خۆ فەرزکردن‌و بەئەنجام گەیشتنی لەووڵاتانی ئیسلامی.

بێگومان علمانیەت بەوپەڕی هەوڵ دانەوە دەستیان کرد بەگۆڕینی فطرەتی خەڵکی ووڵاتانی ئیسلامی‌و بەرنامەی ژیانیا ن بەڵام خەڵکی ووڵاتانی ئیسلامی بەو شێوەیەی کەعلمانیەت دەیویست وەڵامیان نەدانەوەو کەوتنە دژایەتی لەگەڵیاندا، هەربۆیە ئەم دژایەتیە تا ئێستاش بەردەوامە.

گومانی تێدانیە کەعلمانیەت لەووڵاتانی ئیسلامیدا چەندە زۆر بمێنێتەوەو ڕەگ داکوتێ ئەوەندەو زیاتریش لاوازو بێڕێزو پشت گوێ دەخرێت چونکە خەڵکی ووڵاتانی ئیسلامی بەوپەڕی باوەڕو لێبڕانەوە دینی ئیسلامیان قبوڵ کردووەو بەدینی سەرەکی‌و دنیاو قیامەتی خۆیان‌و ئەوانەی دوای خۆشیانی دەزانن، لەبەرئەوە ڕۆژ بەڕۆژ خەڵکی زیاتر پاکی بەرنامەی ئیسلامی بۆ دەرکەوێت و زیاتریش گەندەڵی‌و فەشەلیەتی علمانی بۆ ڕون دەبێتەوە ، بەڵگەی زیندوشمان بریتیە لە((تورکیا))

((بێگومان تورکیا لەدوای ڕوخانی خەلافەتی عوسمانی لەساڵی (١٩٢٣) علمانیەکان فەرمانڕەوای تێدا دەکەن کەیەکەم کەسیان (کمال ئەتا تورکی)) دروست کراوی جولەکەبوو، *ئەتا تورك پێش ئەوەی بێتە سەر کورسی فەرمان ڕەوای لەتورکیا*

لەلایەن جولەکەی صەهیۆنیەتی جیهانیەوە (٤) بەڵێنی لێوەرگیرا کەکاتێ هاتە سەر حوکم دەبێت جێبەجێیان بکات:

(أ) دەست بەجێ جیاکردنەوەی دینی ئیسلام لەبەڕێوەبردنی تورکیا (واتە لەحوکم و سیاسەت)

(ب) دژی هەموو ئەو جوڵە ئیسلامیانە بوەستێ کەلەتورکیادا ئەنجام دەدرێت.

(ج) دژی هەموو ئەو لایەنانە بوەستێ کەدەنگیان دەخەنە پاڵ دەنگی خەلافەتی ئیسلامی و دەبنە پاڵپشتی، بۆ مەبەستی بنیادنانەوەی جارێکی تر .

(د) دەبێت دەستورو تورکیا یاسایەکی علمانی هەڵبژێردرێ غەیری دەستوری ئیسلامی))[1]

بەڵی کاتێ (ئەتاتورك)ی علمانی هاتەسەر حوکم هەرچوار خاڵەکەی جێبەجێکردو بەرپەری تواناو دەستەڵاتی سەربازی بەئاگرو ئاسن بەرپەرچی گەلی موسڵمانی تورکیای دایەوەو سەرجەم یاساو دەستورەکانی ڕۆژئاوای بەسەر خەڵکی تورکیای موسڵماندا جێبەجێکرد هەر لەبواری (ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابوری و ڕۆشنبیری و بوارەکانی پەروەردەو فێرکردن) تاکار گەیشتە ئەو ئەنجامەی گەلی تورکیای موسڵمان یان داڕنی لەئیسلام هەروەك چۆن مەڕێك دادەڕنی لەبەرگ و پێستی خۆی، لەگەڵ ئەمەشدا دەستورو یاساکانی خوای گەورە دورخرایەوە لەکۆمەڵگاو خەڵکی تورکی تەنانەت لەبواری ژیانی خێزانی و یاسا تایبەتیەکانەوە کەپەیوەستە تەنها بەئینسانەوە ((قانون الاحوال الشخصیه)).

بەڵام دوای ئەم هەموو تاوانە کە علمانیەکان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی و گۆڕینی دەستورو بوارەکانی پەروەردەو فێرکردن و بڵاوبوەنەوە گەورەترین بەرەڵای و ڕوتوقوتی ئافرەتان و زۆربونی باڕونادی ئارەق و دروست کردنی دەیان و سەدان هۆڵی بەدڕەوشتی بۆ ڕەقص و سەمای ئافرەتان و زیناکردنی لەگەڵیانداو ئیهانەکردنی ئافرەتانی سەرپۆش بەسەرو پیاوان و گەنجانی موسڵمان و.. سەدان و هەزاران کاری لەمە خراپ تر کەئەنجامیاندا ، بەڵام ئایا ئەتاتورك و پاڵپشتەکانی بەغەرب و وڵاتە زل هێزەکانی دنیاوە توانیان بیروباوەڕی ئیسلامی خەڵکی تورکیا بگۆڕن؟! ئایا توانیان ڕۆشتە ئیسلامی و سەرجەم بەها ئیسلامیەکانی خەڵکی موسڵمانی تورکیا بگۆڕن؟!

---

(١) المؤامرات الدولية ضد الاسلام (تاليف (ام بنان) (ص(٩)

بەڕاستی ئێمە نالێین نەخێر واقع شاهدی ئەم ڕاستییەیە ئەو دەڵێت ((نەخێر)) چونکە لەگەڵ ئەو هەموو کاریگەریەی کەعلمانیەت کردی لەسەر ژیانی گەلی تورکی موسڵمان کەچی ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەگەڕانەوە بۆ باوەشی ئیسلام و زیاتر مزگەوتەکان لەپەرەسەندا بوون ، پەرتوکی ئیسلامی کتێبخانەکانیان دەڕازاندەوەو دیاردەی حیجاب و سەرجەم خورەوشت و ڕوکەشە ئیسلامیەکان لەبەرەو زۆربوندا بوون.

ئەوەندە بەسە کە ڕۆژنامەی (لوموند بلوماتیك)ی فەرەنسی لەبەرواری ١٩٨٣/١/١٨دا دەڵێ:

(( بعد نصف قرن من الحكم العلماني، هناك حديث الان عن انبعاث الإسلام مجدداً في تركيا التي كانت أوائل الدول الاسلامية التي فصلت بين السياسة والدين))[1]

واتە: لەپاش نیوسەدەو فەرمان ڕەوای علمانیەکان لە تورکیا دەنگو باس و ڕوداوێکی تازە هاتەکایەوە کەبریتی بوو لەزیندوبونەوەو هەڵسانەوەی بانگەوازی ئیسلامی، شایانی باسە تورکیا یەکەم دەوڵەتی ئیسلامی بوو کەدینی ئیسلامی لێدورخرایەوە لەبوارەکانی سیاسەت و بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات.

بەڵێ ئەم قسەیە ساڵی (١٩٨٣) وتراوە کە علمانیەت لەوپەڕی هێزو دەسەڵاتیا بووە لەتورکیا بەڵام لەم چەند ساڵەی دوایداو لەساڵی (١٩٩٦)دا بەدیار چاوی هەموو جیهانەوە لە تورکیادا دەست کرا بەهەڵبژاردنی پەرلەمانی بۆ سەرەك وەزیرانی وڵات و لەئەنجامدا (حزبی ڕەفای ئیسلامی) (زۆرینەی) کورسی پەرلەمانی بەدەست هێناو دەنگی لەسەرجەم علمانیەکانی تر زۆرتربوو.

تێبینی: بەڕاستی من نامەوێت لێرەدا باسێکی چڕوپڕی حزبی ڕەفاو چۆنیەتی هەڵبژاردن و هۆی پاشگەزبونەوەی (ئەربەکان) لەکورسی دەسەڵات و چەند شتانێکی تری لەم باسانە شی بکەمەوە، بەڵام ئەوەندەم مەبەستە کەسەرجەم خەڵکی بە(موسڵمان و علمانی)ەوە ئەوە تێبگات کەعلمانیەت لەوڵاتانی ئیسلامیدا نایەتە بەرهەم و بەڵگەشمان بۆ ئەم ڕاستیە ئەوەیە، گەر علمانیەت وەك چۆن لەڕۆژئاوادا پێی داکوتاو جێگیربوو ئاواش لە وڵاتانی ئیسلامی جێگیر بوایە نەبوایە، یەکەم شوێن لەتورکیادا جێی خۆی لەدڵی خەڵکی موسڵمانی تورکیادا بکردایەوە کەبۆماوەی (٧٠) ساڵ زیاترە علمانیەت حوکم دەکات.

---

(١) الاسلام والعلمانية وجهاً لوجه (د. يوسف القرضاوي) (ص: ٦١).

# فکرەو بۆچونی علمانیەکان لەوولآتانی ڕۆژئاوادا

*کاتێك علمانیەت لەوولآتانی ڕۆژئاوادا بڵاوبویەوەو ناسرا لەلای خەڵکی هەوڵیدا کەلەو بەرنامەو فکرەی کەلەسەری دروست بووە پەخشی بکات بەناو خەڵکیداو پەروەردەیان بکات لەسەری کەگرنگ ترین و سەرەکی ترین خاڵی بڕیار لەسەردراوی بەرنامەکانیان ئەمانەبوون:*

(١) خوای گەورە هیچ پەیوەندیەکی بەژیانی دنیای خەڵکەوە نیەو ئیهمال و پشت گوێی خستووە.

(٢) سەرجەم بەها ڕۆحیەکان کە بەندە لە پەروەردگاری نزیك دەخاتەوە کارێکی سلبی و خراپە!! و کۆنەپەرستیە؟

(٣) هەڵبژاردنی ژیانی دنیاو خۆشیەکاتیەکانی و پشت گوێ خستنی ژیانی پاشەڕۆژ و بڕوانەبوون پێی.

(٤) جیاکردنەوەی دین لەدەوڵەت و سیاسەت و دامەزراندن و بنیات نانی ژیانی خەڵکی لەسەر بنچینەی دنیا پەرستی و ماددیەت.

(٥) هەڵبژاردن و کارکردن بەیاسای (الغایه تبرر الوسیله) لە بواری سیاسەت و فەلسەفەو حوکم کردن و سەرجەم کارەکانی تردا، کەئەو دەقەی سەرەوە ئەوە دەگەیەنێت ئینسان بۆ مەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی هەموو ڕێگەیەك بگرێتەبەر جا دروست بێت یان نادروست!!؟

(٦) حەڵاڵکردن و ڕێگەدان بەڕوتی و بەرەڵایی ئافرەتان و سەرجەم کارە جنسیەکانی ترو ڕوخاندن و لەناوبردنی قەوارەی کۆمەڵایەتی و خێزانی.

*بەڵێ گەر بەخێرایی سەیری ئەم شەش خاڵەو ژیانی خەڵکی ڕۆژئاوا بکەین ئەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت کەعلمانیەت توانی بۆ ماوەی چەند ساڵێك سەرجەم پیلان و فکرو بۆچونەکانی خۆی بچەسپێنێ بەسەر خەڵکی ئەوروپادا بەم شێوەیە:*

(أ) بڕوابون بەخواو پەیوەندی خوا بەبەندەوە بو بەبیروباوەڕێکی خەیاڵی و شوێن کەوتوانیشی بەکۆنەپەرست و دواکەوتوو لەدەزگا ئیعلامیەکانەوە باس دەکران تاکار گەیشتە ئەو پلەیەی کەخەڵکێکی زۆر کەم باوەڕیان بەخوای گەورەماو سەرجەم خەڵکی تری ڕۆژئاوا باوەڕیان بەوە هەبوو کە بونەوەر هەر لەخۆیەوە دروست بووەو ئەم

بوونەوەرە دروستکەرو خاوەنی نیە، خۆ ئەگەر خاوەنیشی هەبێت ئەوە دەستی لەدنیاو ژیانی خەڵکی بەرداوەو دروست کراوەکانی خۆی ئیهمال کردووە!!

(ب) سەرجەم ئەو بەها ڕۆحیانەی کەبەندەی لە پەروەردگاری نزیک دەخستەوە بونەوەکارێکی تایبەتی بەچەند کەسانێکی تایبەتی و هەڵگرانی بەناموٚو غەریب دەناسران لەناو کۆمەڵگادا.

(ج) خۆ خەریك کردن بەژیانی دنیاو هەوڵ دان بۆ بەدەست خستنی زۆرترین سەرمایە بو بەگەورەترین خاڵی هەوڵ دانو بەدەست خستنی بەهەر هۆکارێك بێت و لەگەڵ ئەمەشدا ژیانی دواڕۆژ بوو بەبیروباوەڕێکی خەیاڵی و کۆنەپەرستی لەبیری خەڵکی ڕۆژئاوادا.

(د) جیاکردنەوەی دینیش لەدەوڵەت بو بەیەکەم ئیش و کاری حوکم ڕانو فەرمان ڕەواکانی ڕۆژئاوا کەلەوەوپێش و لەفەرەنسادا لەساڵی (١٧٨٩) زاینیدا ڕێگەیان بۆ خۆش کرابوو، ئەویش لەئەنجامی کارە دزێوو نادروستەکانی مەسیحیەت لەوولاٌتانی ڕۆژئاوادا.

(ه) هەروەها کارکردن بەیاسای (الغایە تبرر الوسلیە) کەدەدواەرباەرەی ئەوەی دروست و حەڵاڵە ئینسان بۆ مەبەستی گەیشتن بەئامانجەکانی دنیای سەرجەم ئەو ڕێگانە بەکاربهێنێت کەبەئەنجامی دەگەیەنێت جائەگەر دژیکردن بووە لەباوکو برای خۆت، هەربۆیە ئەم دیاردەیەو کارکردن بەم یاسایە بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو لەناو وولاٌتانی ڕۆژئاوادا بلاٌوبویەوە ئەویش بەردروست بوونی سەرمایەدارو دەستەلاٌت دارەکان کەبەئارەزوی خۆیانو بێگوێدانە بەرژەوەندی گشتی هەوڵی بەدەست خستنی سەرمایەی زۆریان دەدا لەسەر حسابی هەزاران خەڵکی فەقیر ئەویش لەڕێگەی شاردنەوەی خۆراك و هەموو ئەو شتانەی کەژیانی خەڵکی لەسەربەند بوو بۆ کاتی گرانی (احتکار)، هەروەها بەدەست دانەکاری سوخۆری کەئەمیشیان هەر لەسەر حسابی کۆمەڵگاو خەڵکی فەقیر ((بێگومان.یەکێ لەهەرە خاڵە گرنگو بڕیار لەسەر دراوەکانی یاسای ئابوری (راس مالی) علمانی بریتیە لەسو خواردن (الربا) کەلە ئیسلامدا بەوپەڕی توندیەوە هەڕەشە لەو کەسو کۆمەڵانە کراوە کەئەم کارە ئەنجام دەدەن، بەلاٌم لای علمانیەکان کارێکی حەڵاڵە چونکە خاوەنەکەی دەگەیەنێتە مەبەست!!.

( و ) هەروەها بەرەڵایی و ڕوتوقوت بونەوەی ئافرەتان لەژێر حوکمی ڕەشی علمانیەکاندا لەوولآتانی ڕۆژئاوا بو بەیەکەم دیاردەی پێشکەوتن و بەدەست خستنی زانست و ڕزگاربوونی لەهەموو ئەو کۆت و زنجیرانەی کەلەلایەن دینە ئاسمانیەکانەوە بۆی دانرابوون بەڵێ ئەم مەبەستەشەیتانیەشیان بەوپەڕی لێبڕانەوە جێبەجێکردوو ئافرەتانی سەرپۆش بەسەرو داوێن پاکیان کردە باشترین یاری بەردەستی خۆیان بۆ گومڕاکردنی گەنجەکان و دورخستنەوەیان لەدین، هەروەها وێنەی ئافرەتان بوو بەوەی کەلەسەر هەموو شوێنێك بێت و سەیری هەرشتێ بکەی دەست بەجێ وێنەی ئافرەتی ڕووت ببینیت هەر لە(گۆرەوی و بوردەو فلیمی سینەمایی و پاکەتی تایت و شوشەی ئارەق و دەمایەی قۆنەرەو سابون و....))!!؟؟

ئاواو بەم شێوەیە علمانیەت گەورەترین بازرگانی بەشەرەفی ئافرەتانەوە دەکات و بەناوی سەندنەوەی مافیان و ڕزگارکردن و ئازادکردنیان، بەڕاستی ئەوە غەدرو خیانەتە لەئافرەت، ئەمە پیلانە دژی هەموو مافە ڕەواکانی ئافرەت، نەك ئەوەی ئەوان کەباسی دەکەن و دەڵێن ئیسلام مافی ئافرەتی نەداوە، ئێمە دەڵێین ئیسلام هیچ سودێکی نەگەیاندبێ بەئافرەتان ئەوەندەی سودبۆیان هەبورە کەحەیاو شەرەفی ئافرەتانی لەبەرگی پاکی حیجابدا پاراستووەو بەنیوەی کۆمەڵیشی دادەنێ، لەگەڵ ئەمەشدا علمانیەت و سەرجەم ڕێچکە بێدینەکانی‌تر هیچ زیانێکیان نەگەیاندبێ بەئافرەتان ئەوەندە زیانیان لێداون کەشەرەفی ئافرەتانیان بەنرخێکی هەرزان فرۆشت بەکەسانی داوێن پیس و دور لەڕەوشتەکان و ئافرەتیان کردە پارچە گۆشتێکی ڕوت وقوت بۆ ئەوەی هەموو کەسێ خۆزگەکانی خۆیانی پێتێربکات.

بەڵێ علمانیەکان لەڕۆژئاوادا ئابەم جۆرە بیروباوەڕی خۆیان بلآوکردەوەو بەوپەڕی لێبڕانیشەوە هەوڵی بەئەنجام گەیاندنیان دا تاکار گەیشتە ئەوەی فەوضای جنسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی تەنگ بەسەرجەم ڕۆژئاواییەکان هەڵبچنێ و ڕۆژ بەڕۆژ نەخۆشی و کێشەکانیان زۆرتربێت بەتایبەتی نەخۆشیە ڕەوشتیەکانی وەك (ئایدز) کەهەرگیز بۆیان چارەسەر ناکرێ.

<u>تێبینی</u>: ئەو شەش خاڵەی پێشوو لە (الجداول الجامعة فی العلوم النافعەی) شێخ ((جاسم بن محمد بن مهلهل یاسین) وەرگیراوە لاپەڕە (٣٦٢)

## هۆکاری سەرهەڵدانی علمانیەت لەووڵاتانی ڕۆژهەلاتی ئیسلامی

## ( عوامل ظهور العلمانية فى بلاد الشرق الاسلامى )

هەروەك لەوەوپێش و لەباسەکانی سەرەتادا باسمان کرد علمانیەت لەووڵاتانی ڕۆژئاوادا (غرب) بەهۆی حوکمی ڕەشی کەنیسەو خراپ مامەڵەکردنیان لەگەڵ خەڵکیدا دروست بوو، *ئاواو بەم جۆرەش چەند خاڵێکی سەرەکی بوونە هۆکارێك بۆ پەیدابوون و دروست بوونی علمانیەت لەووڵاتانی ئیسلامیدا کەسەرەکیترینیان ئەمانەن:*

١- لەپاش ڕوخانی خەلافەتی عوسمانی و پارچە پارچەکردنی ووڵاتانی ئیسلامی هەروولآتەی کەوتە ژێر دەستەلآتی یەکێ لەدەوڵەتە زل هێزەکانی ڕۆژئاواوە کەبێگومان هەریەك لەو ووڵاتە زل هێزانەی ڕۆژئاوا علمانیبون و کاتێ ووڵاتانی ئیسلامیان کەوتە ژێر دەست و داگیریان کرد لەو ڕێگەیەوە بیروباوەڕی علمانیەتیان چاند لەو ووڵاتانەی کەلەژێر دەستیاندابوو.

٢- دووەم هۆکار بۆ بڵاوبونەوەی بیری علمانیەت لەووڵاتانی ئیسلامی بریتیبوو لەوەی کەووڵاتە علمانیەکانی ڕۆژئاوا هەڵسان بەپەروەردەکردن و پێگەیاندنی زۆرێك لەقوتابیانی علمانی و پاشان ڕەوانە کردنەوەیان بۆ ووڵاتە ئیسلامیەکان بۆ مەبەستی بڵاوکردنەوەو پەرەپێدان بەبیری علمانیەت لەووڵاتانی ئیسلامیدا.

٣- یەکێکی تر لەو هۆکارانە بریتیبوو لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنی علمانی ڕۆژئاوایی کەڕۆڵێکی گەورەو سەرەکی هەبوو لەپەخش کردن و بڵاوکردنەوە بیری علمانیەت لەووڵاتانی ئیسلامی ئەویش لەڕێگەی (تەلەفزیۆن - ڕادیۆ جیهانیەکان و پەخشە سەتەلایتیەکان و سەرجەم هۆکارەکانیتری ڕاگەیاندن)).

٤- دروست کردن و بڵاوکردنەوەی دەیان و سەدان لایەن و حزبی قەومی علمانی لەووڵاتانی ئیسلامیدا وەك (حزب)ی بەعسی عەرەبی و هاوڕێنەکانیان کەئەمەش ڕۆڵی باڵآیان هەبوو لەبڵاوبونەوەی ڕێچکەی علمانی.

٥- قەناعەت کردن بەزۆرێك لەفەرمان ڕەواو دەستەڵآت دارەکانی ووڵآت کە بەیاساکانی خوا کارنەکەن و دین دووربخەنەوە لەووڵآت و سیاسەت و بەیاسا علمانیەکان کاربکەن کە((جمال عبدالناصر و ئەنوەر سادات و مصطفى کمال ئەتاتورك و صدام و . . . .) باشترین بەڵگەن لەسەر ئەم ڕاستیە)[1]

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(فکرەو بۆچونی علمانیەکان لەوولاتانی ڕۆژهەلاتی ئیسلامی (اهم الافکار والمعتقدات العلمانیة فی بلاد الشرق الاسلامی))

هەروەك چۆن علمانیەکان لەوولاتانی ڕۆژئاوادا چەند فکرەو بیرو باوەڕێکی تایبەتیان هەبوو، *ئاواش لەوولاتانی ڕۆژهەلاتی ئیسلامیدا چەند فکرەو بیرۆزێکیان هەیە کەسەرەکی ترینیان ئەمانەن:*

١) تانەو تەشەردان لەئیسلامو قورئانو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت)

٢) بانگەشەکردن بۆ ئەوەی کەئیسلام تەنها چەند دروشمێکی خەیاڵیەو لەگەڵ سەردەمو پێشکەوتنە زانستیەکاندا ناگونجێتو خەڵکی بانگ دەکات بۆ دواکەوتنو کۆنەپەرستی.

٣) بانگەشەکردن بۆ ڕزگارکردنی ئافرەتانو داڕنینیان لەبەرگی حیجاب لەسەر دەستورو مودێکی ڕۆژئاوایی (غەربی)

٤) بانگەشەکردنو هەوڵ دان بۆ زیندوکردنەوەی شارستانیە کۆنەکان ((الدعوة لاحیاء الحضارات القدیمة))

٥) وەرگرتنی پرۆگرامو سەرجەم یاساکانی ژیان لەوولاتانی بەناو پێشکەوتووی ڕۆژئاوا.

٦) پەروەردەکردنی خەڵکانی ژێر دەستەلاتیان بەپەروەردەیەکی بێدینی.

٧) ناشرین کردنو قێزەون کردنی مێژوو شارستانیەتی ئیسلامی لەبەرچاوی خەڵکیداو هەروەها جوان کردنوگەورەکردنی مێژوو و شارستانیە ڕوخێنەرو تۆقێنەرەکان.[1]

*سەرنج بدە!! علمانیەکان لەوولاتانی ڕۆژئاوادا چۆن بیرۆزو یاساکانی خۆیان بەسەر خەڵکیدا جێبەجێکرد ئاواش لەوولاتانی ئیسلامیدا هەمان کاریان ئەنجامداو دووبارەیان کردەوە بەم شێوە:*

أ ) ڕەخنەگرتن لەئیسلامو بەستنی چەندین کۆڕو سیمینارو کۆبونەوە لەسەر ئەوەی کەئیسلام دینی کۆنەپەرستیەو مافی خەڵکی پێشێل کردووە بەتایبەتی (ژنو کرێکار) هەروەها تانەدان لەکەسایەتی بەرزو بێوێنەی پێغەمبەر (ﷺ) کەپیاوێکی نەتەوەپەرستو دنیاپەرست بووەو کاری سەرەکی بریتیبووە لەبانگ کردنی خەڵکی بۆ عەرەبایەتیو نەتەوەپەرستی، هەروەها پیاوێکی دنیا پەرست بووەو هەرخەریکی ژن هێنان بووە!!

---

(١) الجداول الجامعة فی العلوم النافع (جاسم مهلهل)

هەروەها تانەو تەشەردان لەقورئان کەگوایا قسەی (محمد) خۆیەتی‌و ئایەتەکانی قورئانی لە (تەورات‌و ئینجیل)ەوە وەرگرتووە، هەروەها بانگەشەکردن بۆ ئەوەی کەگوایا ئایەتەکانی قورئان دژایەتی‌و کەم‌و کوڕیان لەنێوان دایە[1]و دەیان‌و سەدان بوهتان‌و تانەو تەشەری تری لەم بابەتە کاری بەردەوامی علمانیەکانە لەووڵاتانی ئیسلامی‌دا.

ب ) گەورەترین ووتەی علمانیەکان لەووڵاتانی ئیسلامیدا بریتییە لەوەی کە دەڵێن ئێمە لەبەرئەوە دین لەدەوڵەت جیادەکەینەوە چونکە یاسا دینیەکان چەند یاسایەکی خەیاڵین‌و بۆ ئەم سەردەمەی ئێمە ناگونجێت‌و ئێستاو لەم سەردەمەماندا پێویستە یاسای تازەو نوێ بدۆزینەوە بۆ کێشە نوێیەکانمان!!))[2]

بەڵگەشیان لەسەر ئەم باوەڕە کرمۆڵەیان ئەوەیەکەدەڵێن ئیسلام پێش (١٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش هاتەخوار بۆ عەرەب‌و دورگەی عەرەبی، جا قورئان لەو سەردەمەدا چارەسەری کێشەی عەرەبەکانی ئەو سەردەمەی دەکرد، بەڵام ئێستە ئێمە (١٤٠٠) ساڵ بەرەو پێش هاتوین‌و جۆرە کێشەو حاڵەتێکی تایبەتی مان هەیە غەیری کێشەکەی ئەوان، کەواتە ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەیاسا ئیسلامیەکان لەگەڵ کێشەی ئەمڕۆی خەڵکیدا ناگونجێت‌و پێویستە ڕێگە چارەی تازەونوێ بۆ ئەم گرفتە بدۆزینەوە کەئەویش جیارکدنەوەی دینە لەحوکم‌و سیاسەت‌و دانانی فکرو بیردۆزێکی نوێیە لەجێگەکەیدا.

ج ) علمانیەکانی ووڵاتانی ئیسلامی بەرپەری لێبڕانیانەوە هەوڵیان دا بۆ داڕنینی بەرگی ئیسلامی لەبەری ئافرەتان بەبیانوی ئازادکردن‌و سەندنەوەی مافە خوراوەکانیان، هەروەك چۆن لەووڵاتانی ڕۆژئاوا ئەم کارەیان ئەنجامدا، سەرەنجام کار گەیشتە ئەوەی کەئێستا بەواقعی‌و لەبەرچاوی خۆماندا دەبینین کەچۆن ئافرەتان لەووڵاتانی ئیسلامی ڕوت کراونەتەوەو لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان بەوپەری پێشکەوتوو زانست خواز دەزانن‌و بەرگی حیجابی ئیسلامیش بەنامۆو دواکەوتوو و دور لەزانست دەزانن ئێمەش دەڵێین: گەر ووڵات‌و زانست‌و سەرجەم بوارە خزمەت گوزاریەکانی‌تری ووڵات بەڕوت‌وقوتی‌و بێسەرپۆشی ئافرەتان پێش بکەوتایە ئەوە دەبوو هەر ئەو سەردەمەی کەخەڵکی لەچاخی (بەرد)دا دەژیا (سە . تەیارەو مانگی دەستکردو کۆمپیوتەر...) یان

---

(١) خوێنەری بەڕێز ئاگادارتدەکەم کەکتێبی (معجزة القران)ی محمد متولي الشعراوی بخوێننەوە تاباشترو چڕوپڕتر لەم بابەتە تێبگات.

(٢) بەپشتیوانی خوای گەورە لەسەر باسێکی تایبەتیدا بەرپەرچی ئەم جۆرە گومانە دەدەمەوە کەئاخۆ یاساکانی ئیسلام لەگەڵ کێشە نوێیەکانی ئەمڕۆدا ناگونجێت؟!

دروست بکردایە، چونکە خەڵکی ئەو سەردەمە (واتە چەرخی بەردین) تەنها گەڵایەك یان پێستەیەکی ئاژەڵیان بەپاش و پێشەوە بووەو گشت ئەندامەکانی تری لاشەیان ڕووت بووە!!.

د) بێگومان زیندوکردنەوەی شارستانیە کۆنەکانی وەك (یۆنان و ئیغریق و ڕۆم...) بەیەکە لەو خاڵە سەرەکیانەی بیردۆزی علمانیەت چونکە گەر سەیرێکی فکری علمانیەکان و هەریەك لەو شارستانیە کۆنانە بکەین ئەوە لەدەیان خاڵی هاوبەشدا یەك دەگرنەوەو تەواوکەری یەکترن، *کەگرنگ ترین خاڵی سەرەکی و بنچینەی هەریەك لەو شارستانیە کۆنانەی پێش هاتنی ئیسلام ئەمانەبوون.*

یەکەم: باوەڕهێنان بەئەو مادانەی کەبەرجەستەبوون و بەهەستەوەرەکانی مرۆڤ هەستی پێدەکرا، هەروەها بڕوانەبوون بەو شتانەی کەنادیارن و بەهەستەوەرەکان هەستیان پێناکرێ. ماوراء المادة.

دووەم: تایبەت مەندێتی شارستانیەتە کۆنەکان لەوەدابوو کەرەگەزپەرستی و نەتەوەپەرستی زۆر زاڵ بوو بەسەریانداو لەپێناوی مانەوەی خۆیاندا دژایەتی هەموو کەسێکیان دەکرد، کەئەمڕۆ علمانیەت هەمان ڕێبازی گرتۆتەوە.

سێیەم : خۆ خەریك کردن و بایەخ دان بەژیانی دنیاو خۆشیەکانی و لەبیرکردن و پشت گوێخستنی ژیانی دواڕۆژ، بێگومان ئەمە گەورەترین مەبەستی علمانیەتی ئەم سەردەمەیە.

چوارەم: نەبونی دین و جیاکردنەوەی لەسەرجەم بوارەکانی فەرمان ڕەوای کەبێگومان علمانیەتی ئەمڕۆ هەمان یاسای ئیغریقی و ڕۆمی یۆنانی ئەوسەردەمە دووبارە دەکاتەوە))[1]

ه) شتێکی ئاساییە کەکاتێ علمانیەکان ڕازی‌نەبوون بەدینی خوای گەورە کەحوکم بکات ئەوە بێگومان بیردۆزێکی دەست کردی ڕۆژئاوایی بهێن و ڕەوتی خەباتی سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی و عەسکەری خۆیانی لەسەر پیادەو بەڕێ بکەن، هەر بۆیە ئەمڕۆ علمانیەکانی وولاتانی ئیسلامی سەرجەم یاساکانیان لەیاسای علمانیەکانی ڕۆژئاواوە وەرگرتوەو کاری پێدەکەن و لەوولاتانی ئیسلامی جێبەجێی دەکەن.

و) کاتێ علمانیەکان دینیان لەسیاسەت و حوکمی وولات دورخستەوەو بەرنامەو بیردۆزی ژیانیان لەڕۆژئاوا وەهێنا ئەوە ئەو کاتە دەبێت حاڵی ژیانی ئەو خەڵکەی ژێردەستیان بەرەو کوێمل بنێ و بەچ ڕێگەیەك پەروەردەبێ؟

---

(١) ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين (ابو الحسن الندوي) (ص: ١٥٧).

بێگومان بەپەروەردەیەکی ڕۆژئاوایی و دوور لەپەروەردەیەکی ئیسلامی خوایی، چونکە ڕاستیەکی بەڵگەنەویستە کەهەموو بەرنامەیەك لەکاتی جێگیربوونی دەستەڵاتیدا هەوڵی جێبەجێکردن و بەرقەراربوونی خۆی دەکات لەوجێگەیەدا، لەبەرئەوەی علمانیەکان هەڵگری ئەو بیروباوەڕ و فکرە ڕۆژئاواییەن شتێکی ئاساییە کەخەڵکانی ژێر دەستەڵاتی خۆیان لەسەر پەروەردەیەکی غەربی علمانی پەروەردەبکەن و ڕابهێنن.

خ ) بێگومان لەمێژووی ئیسلامیدا چەند شتانێکی دوور لەئیسلامی ڕوویدا هەر لەشەڕی نێوان (علیکوڕی ابو طالب و معاویە) (خوا لێیان ڕازیبێت) هەروەها لەهەموو سەردەمەکانی تری دوای ئەوان کەئەمەویەکان و عەباسیەکان و دواهەمین جار عوسمانیەکان دەگرێتەوە هۆکاری سەرەکیش بۆ ئەم ڕوداوانە بریتیبوو لەدووری موسڵمانان لەئامۆژگاری و یاسا ئیسلامیەکانەوە و هەروەهاو لەگەڵ ئەم خاڵەشدا دەستی ڕەشی دوژمنانی ئیسلام و بەتایبەتی جولەکە دەورێکی سەرەکیان بینی لەناشرین کردن و ڕوشاندنیکۆمەڵگای ئیسلامی ئەو سەردەمە کە ئێستا بەمێژووی ئیسلامی دەناسرێ، بەڵام علمانیەکان بۆ مەبەستی ناشرین کردن و قێزەون کردنی مێژووی ئیسلامی هەڵسان بەدروست کردنی دەیان و سەدان درۆ و ڕوداوی نەشیاو بۆ ( خولەفای ڕاشدین)و سەرجەم ئەو کەسانەی کەلەپاش ئەوان حوکمیان کرد.

بەڵێ ئێمەی موسڵمان (انکاری) لەو کارە نادروستانە ناکەین کەلەسەردەمی (ئەمەوی و عەباسیەکان و عوسمانیەکاندا کراون بەڵکو ئێمە نارەزایش دەردەبڕین لەبەرامبەریاندان بەڵام دوژمنایەتی علمانیەکان لەوەدایە کەکاتێ باسی مێژووی ئیسلامی دەکەن باسی لایەنە خراپ و ناپەسەندەکانی دەکەن و سەرجەم لایەنە باش و سود بەخشەکانی تری دەشارنەوە.

موسڵمانان لەگەڵ ئەوەی کەتوشی ئەو ڕۆچون و هەڵەو تاوانانە دەبوون لەهەمان کاتیشداو لەهەمان سەردەمی فەرمان ڕەوایەتیاندا گەورەترین شارستانیەت و پێشکەوتن ڕوی دەدا لەسەردەستیان، بەڵێ هەر لەم کاتەدا بوو کەبانگەوازی ئیسلامی بەهەموو لایەکی جیهاندا بڵاوبویەوەو پۆل پۆل خەڵکی لەتاریکیەکانەوە ڕزگار دەکردو بەرەو ڕوناکی ئیسلام دەیهێنان، ئەم بانگەوازە ئیسلامیە بۆ ماوەی (٨٠٠) ساڵ خۆی گرت و بەردەوام بوو)).[١]

---

(١) کیف نکتب التاریخ الاسلامی (محمد قطب)

# چەند هەڵوێستێکی علمانیەکان

## (١) هەڵوێستی علمانیەکان دەربارەی بیروباوەڕی ئیسلامی (العقیدة الاسلامیة):

بێگومان علمانیەکان ئینکاری بواری عەقیدەی ئیسلامی ناکەن‌و ڕێگەش لەخەڵکی ناگرن کەباوەڕیان بەخواو پێغەمبەران‌و ڕۆژی دوای‌و سەرجەم لایەنەکانی‌تری بیروباوەڕەوە هەبێت بەڵکو علمانیەکان ئەم جۆرە بیروباوەڕانە بەمافێکی تاکە کەسی‌و سەربەستی هەموو کەسێك دەزانن!!

بەڵام ئەو مافەی کەعلمانیەت دەیدات بەخەڵکی‌و ئینسانەکان ئازاد دەکەن لەسەرئەوەی کەباوەڕی بەبنچینەکانی باوەڕ هەبێت تەنها ئەوەندەیە کەئەو کەسانە باوەڕێکی سادەو ساکارو بێگیان یان هەبێت‌و لەژیانی ڕۆژانەیاندا کاری پێ‌نەکەن‌و ڕەنگ دانەوەی لەگوفتارو کردارەکانیاندا نەبێت.

لەگەڵ ئەمەشدا علمانیەت بەرپەرچی ئەو بیروباوەڕە دەداتەوە کەبکرێتە بنچینەیەك بۆ هەڵسەنگاندنی کارەکان‌و بەئەنجام گەیاندنیان، یان ئەو بیروباوەڕە بکرێتە یاسایەك لەژیانی خەڵکیداو کێشەو گرفتەکانیانی پێ‌چارەسەر بکەن.

پاشان موسڵمانان کاتێ ژیان لەژێر دەستەڵاتی علمانیەکاندا ئازادن کەخاوەن‌و هەڵگری بیروباوەڕی تایبەتی خۆیان بن، بەڵام سەرجەم یاسا علمانیەکان دژی بیروباوەڕە ئیسلامیەکانە چونکە بەبیروباوەڕی ئەو خەڵکە کەلەلایەن خوای گەورەوە دانراوە چەند شتانێك حەرام دەکات بەڵام یاسا علمانیەکان حەڵاڵیان دەکات یان بیروباوەڕی ئیسلامی چەند شتانێك حەڵاڵ دەکات‌و هانی خەڵکی دەدات لەسەر بەئەنجام گەیاندنی بەڵام یاساو دەستورە علمانیەکان بەپێچەوانەوە هانی خەڵکی دەدەن لەسەر نەکردن‌و بەئەنجام نەگەیاندنی.

بەڕاستی ئەو بیروباوەڕەی کەئیسلام لەخەڵکی داوادەکات زۆر جیاوازە لەوبیرو باوەڕەی کەعلمانیەکان دەیانەوێ خەڵکی باوەڕیان پێ‌ی‌بێت.

ئیسلام بیروباوەڕو دروشمی یەکتاپەرستی دەکاتە کاڵایەکی زۆر بەنرخ‌و داوا دەکات لەسەرجەم خەڵکی کەبیکەنە دروشم‌و یاساو ڕێسا لەژیانی ڕۆژانەی خۆیاندا، دروشمی یەکتاپەرستی سەرجەم بوارو لایەنە جۆراوجۆرەکانی سەرتاسەری ژیانی ئینسانیان گرتۆتەوە، هەر لەسەرتای لەدایك بوونەوە تاکاتی ناوگۆڕ، ئەویش بەوەی کەکاتێ منداڵ لەدایك دەبێت بانگی یەکتاپەرستی (الله اکبر)و(لا الـه الی الله) دەدرێت

بەگوێچکەیداو بانگی پێغەمبەرایەتی (محمد)یش بەدوایدا دێت بەدروشمی (وان محمداً رسول الله) .

بەڵێ بیروباوەڕو یەکتاپەرستی دروشمی ژیانی ئینسانەکانەو تەنها ووشەیەکی سادەو بێواتا نیە کەلە دەمەوە بێتە دەرەوە بەڵکو دروشمی یەکتاپەرستی باوەڕێکە کەمەڵگران و بێژەرانی دەی‌سەلمێنن کەسەرجەم بوارە فکری و دەرونی و ڕەوشتی و عەمەلی و کۆمەڵایەتەکانیان بەکێشانەی ئەو یەکتاپەرستیە مەزنەدەکەن و لەسەر ڕێڕەوی لانادەن.

## ( ٢ ) هەڵوێستی علمانیەت دەربارەی پەرستنی خوای گەورە ( العبادة ) :

هەروەك چۆن علمانیەت بواری دا بەخەڵکی کەئازادن لەوەی باوەڕیان بەخواو بەسەرجەم لایەنە نادیارو غەیبییەکان هەبێت، ئاواش ڕێگە لەخەڵکی ناگرێت کەهەرجۆرە بەندایەتیەك ئەنجام بدەن و هەرجۆرە دروشمێکی بەندایەتی بەرزبکەنەوە بەڵام ئەم جۆرە عیبادەتە هیچ بایەخ و گرنگیەکی ئەوتۆی نیە بەلای علمانیەکانەوەو بەمەبەستی سەرەکی کاری مرۆڤەکانی نازانن لەژیاندا،هەروەها علمانیەکان (زەکات)دان بەبناغەو دروشمی بنەما ئابوریەکان نازانن و لەبری یاسای زەکات دوویاسای تری وەك (راس مالیەت و اشتراکیەت)یان هەڵبژاردووەو کاریان پێ‌دەکەن.

بەڵام تێڕوانینی ئیسلام بۆ عبادەت و سەرجەم دروشمەکانی یاساو بەرنامەیەکی زۆر جیاوازی داڕشتوە بەپێچەوانەی بۆچونی علمانیەکان، ئیسلام (عبادەت)و پەرستن بەدروشمی سەرەکی و هەرەگەورەی مرۆڤەکان دەزانێ لەژیانیدا هەروەك دەفەرموێت:

﴿وما خلقت الجن والانس الا لیعبدون﴾ (الذاریات :٥٦) بەوواتایەی‌کە کاری سەرەکی و هەرەگەورەی مرۆڤ و جنۆکە لەدنیادا بریتیە لەعبادەت کردنی خوای گەورە، بێگومان عبادەت کردنی خوای گەورەش تەنها لەسنوری (نوێژو ڕۆژو حەج و زەکات و چەند دروشمێکی‌تردا) کۆنەبۆتەوە بەڵکو مانای عبادەت لەئیسلام دا زۆر لەوە گەورەترەو مرۆڤ هەر کارێکی کرد لەژیاندا، گەر ڕاست بێت و لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگاری بیکات بەعبادەت بۆی حساب دەکرێت، هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿قل ان الصلاتی ونسکی ومحیای ومماتی لله رب العالمین﴾ ...واتە: بلێ (نوێژو و قوربانی و هەموو ژیان و مردنیشم تەنها بۆ پەروەردگاری جیهانەو بۆ کەسی ترنیە.

بەڵێ ئەوە یاسای عبادەت و پەرستنەکانە لای ئیسلام، بەڵام وەك وتمان علمانیەت بەو شێوە فراوانە لەناوەڕۆکی عبادەت حاڵی نەبووەو تەنها بەو شێوە سادەیە نەبێت کەباسمان کرد.

## (٣) هەڵوێستی علمانیەت دەربارەی خورەوشت (أخلاق):

*تائێرا زانیمان کەعلمانیەت دەربارەی عبادەتو ئیسلامو عەقیدە رایان چۆنەو چی دەڵێن، ئاخۆ دەبێت دەربارەی رەوشت (اخلاق) چی بڵێن؟!*

### (أ) لەبواری پەیوەندی هەردوو توخمی (نێرو مێ):

علمانیەکان لەگەڵ ئەوەی باوەڕیان بەڕەوشتە ئیسلامیەکان هەیەو پێشوازی لێدەکەن کەچی لەم خاڵەدا گەورەترین جیاوازیو دژایەتی هەیە لەگەڵ دەستورە بڕیار لەسەر دراوەکانی ئیسلام دەربارەی پەیوەندی نێوان ژنو پیاو، ((علمانیەکان پەیوەندی نێوان هەردوو جنسی نێرو مێ بەکارێکی زۆر ئاسایی و مافێکی زۆر ڕەوای ژنو پیاوی دەزانن‌و بەو واتایەی کە ژنو پیاو مافی ڕەوای خۆیانە کەکاری جنسی لەگەڵ یەکتردا ئەنجام بدەن بێ‌ئەوەی محاسبە بکرێن لەسەری، هەروەها تێکەڵ بوونی پیاوان بەئافرەتان‌و کۆبونەوە لەگەڵ یاندا بەڕەواترین مافی هەردووکیان دەزانن‌و بەوپەڕی پێشکەوتنی دادەنێن هەربۆیە لەسەرجەم وڵاتانی (ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا) (غرب - شرق) سەرجەم قوتابخانەکان لەسەریەك دەستورنەکەئەویش بریتیە لەتێکەڵ بونی کوڕو کچ (اختلاط) هەر لەقۆناغەکانی سەرەتایی تا دواقۆناغەکانی خوێندنی باڵا.

هەروەها علمانیەت بەوپەڕی توندیەوە لەزۆرێك لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا بڕیار لەسەر ئەو یاسایەدا کەنابێت قوتابیانی زانکۆ بەبەرگی حجابی ئیسلامیەوە بێن بۆ زانکۆ! (لەکاتێکیشدا علمانیەکان خۆیان بەهەڵگری دروشمی دیموکراتی دەزانن‌و دژی سەرجەم یاسا دکتاتۆریەکانن)!!

وەهەروەها لەزۆرێك لەوڵاتانی‌تردا ئەم کارە ئەنجام دەدەن‌و بەردەوامیش لەهەوڵ داندان بۆ داڕنینی بەرگی حجاب لەبەری ئافرەتانی موسڵمان.

بەڵام یاساو دروشمە ئیسلامیەکان چ لەپوکەش‌و چ لەناوەڕۆکدا جیاوازیو دژایەتیەکی زۆر توندی هەیە لەگەڵ باوو دروشمە علمانیەکان دەربارەی ڕەوشتو سەرجەم بەها ڕەوشتیەکانی‌تر چونکە ئیسلام هەموو ئەو دەرگایانە دادەخات کەبۆنی بەدڕەوشتیو فەوضای جنسیو فتنەبازی لێوەدێت، چونکە خوای گەورە زاناترە لەنیمەی بەندە ئەگەر بێتو بەوشێوەی علمانیەکان هەموو کارێکی جنسی حەڵاڵ دەکەن‌و بەڕەوای دەزانن ئیسلامیش وابێت، ئەوە کەشتی کۆمەڵگاو ژیانی مرۆڤەکان‌و یاساکانی وڵاتو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان بەرەو تیاچوون‌و نوقم بوون دەچن، هەروەك ئێستا لەوڵاتانی ڕۆژئاوای علمانیدا ئەم ڕاستیە بەچاوی خۆمان دەبینین

کەبەهۆی ئەو ڕێدان بەکاری تێکەڵیەی نێوان ژن و پیاو گیرۆدەی گەورەترین و ترسناک ترین کێشەبوون کەبریتیە لەکێشەی جنسی و زۆرێك لەدانیشتوانی وولآتانی ڕۆژئاوا گیرۆدەی نەخۆشی (ئایدزن) کە لە ئەنجامی ئەو تێکەڵی و پەیوەندیە نادروست و شەرعیانەوە دروست دەبێت کەعلمانیەکان بەمافی ڕەواو گەورەی ئافرەت و پیاوی دەزانن.

بەڵێ ئیسلام هەر لەسەرتاوەو پێش ئەوەی کۆمەڵگا بەرەو ئەو کێشەو نەخۆشیانە بڕوات دەیان و سەدان دەستوور و یاسای بۆ چارەسەرکردن و بڵاونەبونەوەی ئەو نەخۆشیانە داناوە کەبریتین لە:

﴿ولا تقربوا الزنى انه كان فاحشة وساء سبيلا﴾ (الاسراء:٣٢)

واتە: لەزیناو بەدڕەوشتی نزیك مەکەونەوە چونکە زیناکردن کارێکی ناڕەواو ڕێگایەکی خراپە. یان بەئافرەتان دەفەرموێت: ﴿ولا يبدين زينتهن الا ماظهر منها وليضربن بخمورهن على جيوبهن﴾ (النور:٣١).

واتە: بائافرەتان جوانی لاشەی خۆیان دەرنەخەن بۆ پیاوان و کەسانی نامەحرەم تەنها دەم و چاو و دەستیان نەبێت هەروەها سەرپۆش بدەن بەسەریانداو سەرسنگ و لاشەیان داپۆشن و بەدەرەوە نەبێت.

یان: ﴿قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم ويحفظوا فروجهم ذالك أزكى لهم﴾ (نور:٣٠).

واتە: ئەی محمد بڵێ بەپیاوان کەچاوەکانیان لەئاست ئافرەتانی نامەحرەمدا دابخەن و سەیریان نەکەن و هەروەها داوێن پاکیش بن و کاری بەدڕەفتاری ئەنجام نەدەن، بەڕاستی ئەمە زۆر پاکتر و چاکترە بۆیان.

هەروەها بەئافرەتانیش دەڵێ:

﴿وقل للمؤمنات يغضضن من ابصارهن ويحفظن فروجهن...﴾ (نور:٣١).

واتە: هەروەها بەئافرەتان یش بڵێ کەچاویان لەئاست پیاوانی نامەحرەم دا دابنەوێنن نوو سەیریان نەکەن و داوێنی خۆشیان بەپاکی ڕابگرن...))

هەروەها ئیسلام کۆبونەوەو دانشتنی ژن و پیاوێکی نامەحرەمی قەدەغەکردووە کاتێ بەتەنها لەژوورێکدا دابنیشن و قەدەغەی سەفەرکردنی ئافرەتی کردووە بەتەنها و بەتایبەی کاتێ ئەو شوێنەی بۆی دەچێ ئەمین نەبێت و مەترسی لێبێ.

## (ب) لەبواری بەستنەوەی ڕەوشت لەگەڵ دیندا (اخلاق و دين):

علمانیەکان بەهیچ جۆرێك خۆشحاڵ نین بەبەستنەوەی دین بەڕەوشتە بەرزەکانەوە بەو مانایەی کەبەها ڕەوشتیەکان هیچ پەیوەندیەکیان بەدینەوە نیە بەڵکو پەیوەندیان بەفەلسەفەو مرۆڤ خۆوەیەتی!!

**( ٤ ) هەڵوێستی علمانیەكان دەربارەی شەریعەتی ئیسلامی :**

بێگومان گەورەترین لایەنێك كەعلمانیەت دژی بوەستێ‌و هەوڵی لەناوبردن‌و سەركوت كردنی بدات لاینەی شەریعەتی ئیسلامیە، چونكە علمانیەت وای دەبینێ كەدەبێت تەنها خۆی یاساو بەرنامە بۆ كێشەی ئینسانەكان دابڕێژێ‌و ئەم كارە مافی ئیسلام نیەأبەو واتایەی كەبەئارەزوی خۆی هەرچی ویست حەڵاڵی بكات‌و ئەوەی نەویست حەرامی بكات؟!! بەم كارەشی حەقی بەڕێوەبردن‌و پەروەردگاریێتی لەخوای گەورە دەسێنێتەوەو دەیكاتە بەری خۆی، بەڵێ علمانیەت فیرعەون ئاسا بانگەشەی خوایەتی خۆی دەكات‌و بەسەرجەم ئینسانەكان دەڵێ:

((ئەی خەڵكینە یاساكانی خوا بەكەڵكی ئێوە نایەن‌و لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەتاندا ناگونجێت‌و چارەسەری كێشەكانتان بەتەواوی ناكات؟! بەڵام ئێمە . واتە . (علمانیەت) بەرنامەو بیردۆزو یاسایەكتان بۆ دادەڕێژین‌كەلەیاساكانی خوا زۆرباشتر بێت‌و چارەسەری تەواوی كێشەكانتان بكات؟!))

بەڵێ علمانیەكان باوەڕیان بەوە نیە كەخوای گەورە تەشریع‌و یاساو ڕێسا بۆ دروست كراوەكانی خۆی دابنێ‌و مەرجی بكات لەسەریان كەبەپێی ئەو یاسایانە كردەوە بكەن‌و بجوڵێنەوە، بەڵام قورئان پێش (١٤٠٠) ساڵ زۆر بەتوندی بەرپەرچی ئەم جۆرە باوەڕە بێبنچینەو ناوەڕۆكە دەداتەوەو دەڵێ: ﴿ألا له الخلق والامر﴾ (الاعراف:٥٤)[1]

واتە: ئایا كاری بەدی‌هێنان‌و فەرمان كردن تەنها هەر بۆ خوای گەورە نیە؟! بەڵێ هەروەك چۆن كارو سیفەتی بەدی‌هێنان لەنەبونەوە تەنها پەیوەستە بەخوای گەورەوەو كەس تێیدا بەشدار نیە، ئاواش كارو سیفەتی بەرنامە دانان‌و فەرمان كردن تەنها كاری پەروەردگارەو نابێت كەس تێیدا بەشداربێت.

## یاساكانی شەریعەتی ئیسلام‌و كێشەو گرفتەكانی ئەمڕۆ

وەك بڕیارماندا لەباسەكانی پێشوو‌داو لەسەرە باسێكی تایبەتیدا بەرپەرچی گومانی خراپی علمانیەكان بدەینەوە دەربارەی یاسا بڕیار لەسەر دراوەكانی ئیسلام‌و كێشە نوێیەكانی ئەمڕۆ، علمانیەكان دەڵێن ((قورئان لە سەرەتادا لەكۆمەڵگایەكدا دروست بووو بڵاوبویەوە كەخەڵكی ئەو سەردەمە چەندین جۆر دارو بەردو بتیان

---

(١) مانای ئەم ئایەتە بەم شێوەیە: ئاگاداربن ئادەمیزاد كاری دروست كردن‌و فەرمان بەسەرادان هەر لەبۆ خوایە.

دەپەرستو دەستەلأت داران بێچارەو بێدەستەلأتەكانیان دەچەوساندەوەو خەڵكی خوێنو گۆشتی مردارەوە بووی دەخوارد.

هەروەها تایبەت مەندێتی ئەو كۆمەڵگایە وابوو كەكچیان زیندەبەچاڵ دەكردو یاسای بەندایەتی (قانون العبودیة) هەبوو كەدەستەلأت دارو دەوڵەمەندەكان بازرگانیو كڕینو فرۆشتنیان بەكەسانی ڕەش پێستو غەریبو فەقیرەوە دەكردوو وەك سەرجەم پێداویستیەكانی تری ئینسان لەبازاڕو شوێنە گشتیەكاندا دەفرۆشران (سلمانی فارسیو بلالی حەبەشی) باشترین بەڵگەن بۆ ئەم ڕاستیە،

هەروەها دەربارەی خوێندنو بوارە زانستیو هونەریو پزیشكیەكانی تریش كۆمەڵگای مەككەو عەرەبی ئەو سەردەمە زۆر زۆر دواكەوتووبوونو تەنانەت هەندێكیان هەر بەپێ‌خاوسی دەڕۆیشتو هیچیان لەپێ نەدەكرد. وەهەزارەها جۆر شتیتر لەم بابەتە.

بەڵێ ئیسلام لەم كۆمەڵگایەدا دەركەوتو بەپێی حاڵو كێشەیو گرفتی ئەو خەڵكە یاسای دادەڕشتو فەرمانی دەكرد، لەبەرئەوە ئیسلام لەسەردەمی خۆیدا زۆر گونجاوبوو بۆ كێشەو گرفتەكانی عەرەبی ئەوكاتەو ناوچەكە، بەلأم لەگەڵ بەرەو پێش چوونی دنیای زانستو تەكنەلۆژیو سەرجەم بوارە كۆمەلأیەتیەكانی مرۆڤەكان، كێشەو گرفتی نوێ هاتنەكایەوەو ژیانی خەڵكی بەرەو پێش تر ڕۆیشتو بەشێوەیەكیتری لێهات.

**جا بەڵگەشمان[1] لەسەرئەوەی كەقورئانو شەریعەتی ئیسلامیو یاساكانی ئیسلام بەكەڵكی ئەم سەردەمە نایەت ئەم چەند خاڵەی خوارەوەیە.**

(أ) قورئان لەسەرتادا بۆ كۆمەڵگایەك هات كەكێشەی بت پەرستیو دارو بەرد پەرستنیان هەبوو و كڕنوشیان بۆ ئاژەڵو ئینسانو شتەكانیتر دەبرد بەلأم ئێستا خەڵكی پێش كەوتووەو ئامادە نیە كڕنوش بۆ بتو هیچ شتێكیتری لەم بابەتانە ببات، لەبەرئەوە قورئان بەكەڵكی ئەم سەردەمە نایەتو یاساكانی كۆن بوون نزیكەی (١٤٠٠) ساڵ زیاتر ئینسانەكان بەرەو پێش چوونو یاساكانی شەریعەتی ئیسلامی شمولی كێشە نوێیەكانی ئەم سەردەمە ناكات، كەواتە لەخاڵی یەكەمدا دەڵێین مێژوو و واقع گەورەترین بەڵگەن لەسەر ئەوەی كەقورئان كۆن بووەو بەكەڵكی ئەم سەردەمە نایەت!!!!؟

---

(١) جا بەڵگەشمان، واتە: بەڵگەی ئێمەی علمانی.

بەڵێ ئێمەش لەوەڵامی ئەم گومانە خراپو بێناوەڕۆكەدا دەڵێین:

(ڕاستە قورئان (پێش ١٤٠٠) ساڵ لەناو عەرەبو گەلێكی بت پەرست هاتە خوارەوەو كاری سەرەكیی‌شی بریتی‌بوو لەفێركردنو تێگەیاندنی ئەو خەڵكە لەخوای گەورەو دروشمی یەك خواناسی (توحید)و سڕاندنەوەو شكاندنی خۆزگەی بت پەرستی لەدڵیاندا، بەڵام كێشەكە لێرەدا كۆتای نایەتو تەواو نابێت هەروەك چۆن علمانیەكان بەخەیاڵی خۆیان ئالێرەدا كێشەكە كۆتای پێدێننو دەیكەنە بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی كەقورئان بەكەڵكی ئەم كۆمەڵگاو سەردەمە نایەت بەبیانو وبەڵگەی ئەوەی كەئێستا خەڵكی پێش كەوتووەو دارو بەردو بت ناپەرستێ، نەخێر مەسەلەكە بەوەندە كۆتای نایەت چونكە دیاردەی پەرستن شتێكی فطریو دەروونیەو لەناخی هەموو كەسێكدا هەبووە بەدرێژای مێژوو هەروەك ((هەنری برجسون)) دەڵێت: ((بەدرێژای مێژوو ڕێكەوتووەو هەبووە كەوڵاتو شارستانیەتە كۆنەكان بێ قوتابخانەو نەخۆشخانە مابێتنەوەو ئەم لایەنانە لەناریاندا نەبووبێ بەڵام هەرگیز میللەتێ نەبووە لەسەر زەویدا كەبێپەرستگا مابێتنەوە (خوا)یان غەیری (خوایان) نەپەرستبێ)).[1]

جابت پەرستی بەپێی سەردەمو بەرەو پێش چوونی ژیانی خەڵكیو گۆڕان كاریە كۆمەڵایەتیەكان دەگۆڕێتو بەرگێكی‌تر لەبەردەكاتو ناوێكی‌تر لەخۆی دەنێ، لەسەردەمی خۆیدا خەڵكی بەدەستی خۆیان لەدارو بەرد وێنەی پیاو چاكێك یان ئاژەڵێك یان هەر شتێكی‌تری لەم بابەتەیان دروست دەكردوو كڕنوشیان بۆدەبرد هەروەك لەصەحیحی (بوخاری)دا هاتووە كەیەكێ لەهاوەڵان دەفەرمێت ((كنا نعبد الحجر، فاءذا وجدنا حجرا هو خیر منه القیناه واخذنا الاخر))[2]

واتە: ئێمە بەردمان دەپەرست، بەڵام گەربەردێكی باشترو چاكترمان دەست بكەوتایە ئەوە ئەو بەردەی پێشوومان فڕێدەداو بەردە جوانو چاكەكەمان دەكردە خوای خۆمانو هەڵمان دەگرت.

لەپاش ئەوەی كەخەڵكی بەرەو پێش چوونو سەرجەم بوارەكانی ژیانی ئینسان پێشكەوتو خەڵكی بەڕووكەش دەستی لەبت پەرستی هەڵگرتو كڕنوشی بۆ دارو بەردوو شتەكانی‌تر نەدەبرد؟! بەڵام علمانیەكان هەرئەوەندە حاڵی بوون لەبت پەرستی

---

(١) وجود الله/ دكتور یوسف القرضاوی (ص: ٢٣).

(٢) روا البخاری عن ابی رجاء العطاردی (كتاب المغازي باب وفدبني حنیفة)

کەئینسان کڕنوش بەرێت بۆداور بەردوو شتی‌ترا! نەء !! وانیە ئەمڕۆ خەڵکی بەشێوەو شێوازێکی تربت دەپەرستن‌و کڕنوش بۆبت دەبەن ئەویش کەشوێن نەفسیان کەوتوون‌و کردویانە بەخوای خۆیان‌و لەڕێگەی ڕاستی دورخستونەتەوە/قورئان نەفسی ئینسانی بەخوایەك ناوبردووەو دەفەرمێت:

﴿افرأیت الذی اتخذ الهه هواه﴾؟!

واتە: ئایا نابینیت کەوا نەفسی خۆیان کردۆتە خوایەك‌و دەی‌پەرستن.

هەروەها ئەمڕۆ لای هەندێ کەس زانست بۆ تەخوایەك‌و دەی‌پەرستن، لەهندستاندا مانگاو داور بەردو هەزارەها جۆر شتی‌تر دەپەرستن. هەربۆیە (غاندی) دەڵێ: .

((من لەبەردەم هەموو جیهاندا بەرگری لە (گا) پەرستی دەکەم چونکە خۆم (گا) پەرستم))[1] یان لەجێگایەکی‌تردا دەڵێ: .

((مانگا زۆر لەدایکم بەرێزترە چونکە دایکم بۆ ماوەی دوو ساڵ یان کەم تر شیرم دەداتی‌و لەپاشاندا لێم دەبڕێتەوە، بەلام مانگا بەردەوام شیرم دەداتی‌و تادەمرێ خزمەتم دەکات)).[2]

هەروەها بوزیەکان لەصین‌و یابان‌و چەند ولاتێکی‌تر تا ئێستاش پەیکەری (بوزا) دەپەرستن، بەڵێ ئەمڕۆ لەم چەرخی پێشکەوتنەداو لەسەدەی (٢٠)دا خەڵکی دەیان‌و سەدان بتی جۆراوجۆر دەپەرستن‌و لەبری خوای گەورە گوێ ڕایەڵیان دەکەن بەلام لەشێوەو شێوازێکی نوێداو بەجۆرێکی‌تر.

کەواتە بەپێی ئەم پاسایەی سەرەوە خەڵکی ئەمڕۆ زیاتر پێویستی بەئیسلام‌و یاساکانی هەیە چونکە لەسەردەمی خۆیدا. واتە(١٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش هەموو کەس بت پەرستی‌و خواپەرستی لەیەکتر جیادەکردەوەو دەیان زانی کەشوێن کەوتنی پێغەمبەرو قورئان واتای یەکتاپەرستی‌و یەك خواناسی دەگەیەنێت‌و شوێن کەوتنی ابوجهل‌و ئەبولهب وعتبە وشیبە.... هتد) بت پەرستی‌و داور بەردو پەرستی دەگەیەنێ.

بەلام خەڵکی بەناو زانست خوازو پێشکەوتوو ئەمڕۆ علمانیەت‌و شیوعیەت‌و بەرنامەو بیردۆزی ڕۆژئاوایان کردۆتە خوایەك‌و بەردەوام لەهەوڵ داندان لەبانگ کردنی خەڵکی بۆ پەرستن‌و بەگوێ‌کردنی!!

---

(١) الرسل والرسالات (دکتور عمر سلیمان الاشقر) (ص: ٣٧).

(٢) هەما سەرچاوەی پێشو.

لەبەرئەوە ئەمڕۆ ئیسلام زۆر پێویست تره کەخەڵکی لەو کۆمەڵە بتە زل زلو شاخ دارو بریقەدارە ڕزگار بکاتو بەرەو یەکتاپەرستیو یەك خواناسیان بهێنێتەوە هەروەك چۆن لەسەرەتادا(٣٦٠) بتی ناو کەعبەی لەناوبردوو ڕێڕەوی کڕنوش بردنی خەڵکی لەو کۆمەڵە بتە زۆرەوە گۆڕیو بەرەو یەك خواوکۆچی پێکردن کەئەویش بریتیبوو لە ((لا اله الا الله فاعبده))

(ب) دووەم بەڵگەی علمانیەت لەسەر ئەوەی کەدەڵێت قورئان باوی نەماوەو یاساکانی بەکەڵکی ئەم سەردەمەنایەت بریتیە لەوەی کە:-

((ئیسلام لەکۆمەڵگایەکی نەفامی عەرەبیدا پەیدابوو کەدەستەڵات دارو سەرمایەدارەکان بێدەستەڵاتو هەژارەکانیان دەچەوساندەوەولە بازاڕو شوێنە گشتیەکاندا وەك ڕاخەرو جلوبەرگو پێویستیەکانی ناومال دەیان فرۆشتنو (بیلالی حەبەشیو سەلمانی فارسی) باشترین بەڵگەی زیندون لەسەر ئەم ڕاستیە!! ((کلمة حق یرید بها الباطل))

جا علمانیەکان دەڵێن ئێستا لەدنیای هاوچەرخو پێشکەوتوو خوازادا ئەو یاسا نەفامیو چینایەتە باوی نەماوەو خەڵی سەربەستەو کەس ناتوانێت کەسیتر بەناوی سەرمایەداریو دەوڵەتداریەوە بچەوسێنێتەوەو کەسیشمان نەدی لەم سەردەمەدا وەك کالایەك لەبازاڕەکاندا بفرۆشرێ.

بەڵێ ئێمەش دەنگمان دەخەینە پاڵ دەنگی علمانیەکانو دەڵێین:

(( ڕاستە کاتێ ئیسلام گەیشت بەکۆمەڵگای جاهلی عەرەبی ئەو سەردەمە دەوڵەت دارو سەرمایەدارەکان کەم دەستەڵاتو هەژارەکانیان دەچەوساندەوەو گەر یەکێ ڕەش پێست یان غەریب یان هەژار بوایە ئەوە دەکرا بەبەندەی خەڵکیو زۆرجاریش لەبازاڕو شوێنە گشتیەکاندا دەفرۆشرا!!

بەلام هەروەك چۆن خاڵەکەی پێشوو بەوەندە تەواو نەبوو ئاواش بەم جۆرە ئەم خاڵەشیان تەواو نابێتو کۆتای نایەت چونکە مێژوو بەردەوام لەدووبارەبونەوەدایەو بەم شێوەیە ((لەکۆمەڵگای جاهلی عەرەبی کۆندا یاسای چەوساندنەوەو فرۆشتنی بەندە هەبوو وەك لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، بەلام گەر بەخێرای سەیرێکی دنیای پێشکەوتووخوازو زانست دۆستی ئەم سەردەمە بکەین ئەوە ئەو ڕاستیانەمان بۆ دەردەکەوێت کەهەمان ڕوداووی چەوساندنەوەی هەژارانو فرۆشتنیان لەلایەن دەوڵەت دارو دەستەڵات دارەکانەوە زۆر بەڕۆشنی دەبینینو هەمان یاسای جاهلی بەردەوام

لەدوبارەبونەوەدایە، ئەمڕۆ سەرمایەداران بەناوی یاسای (راس مالیەت)ەوە دەستیان خستۆتە گۆشتو خوێنی کۆمەڵگاو بەئارەزوی خۆیان مامەڵەو بازرگانی بەسەر ژیانی خەڵکیەوە دەکەن.

بێگومان لەیاسای ئابوری سەرمایەداری (راس مالیەت)دا حەڵاڵە کەمرۆڤ بۆ بەدەست هێنانی گەورەترین سەرمایەو پارەی زۆر سەرجەم ئەو ڕێگایانە بەکاربهێنێت کەدەیگەیەنێتە مەبەست (جا دزی دەکات یان خواردن دەشارێتەوە یان دەست دەگرێت بەسەر کەنزێکی ئاڵتوندا یان هەر شتێکی لەم بابەتە).

بەڵێ لەیاسای علمانی (راس مالیەت)دا ئەم جۆرە کارە هەیەو بەمەش سەرمایەدارەکان دەبنەخۆرەو دەستەڵات دار بەسەر هەزارانەوە (کەهەمان یاسای جاهلی عەرەبی سەردەمی خۆیەتی و لەناوێکیتردا خۆی نیشان دەدات).

هەروەها یاسایەکی تری ئابوریمان هەیە کەبەپێچەوانەوانەی یاسای سەرمایەداری (راس مالیەت)ەوەیە کەبریتیە لەیاسای ئابوری (اشتراکیەت) کەئەمیش بیردۆزێکی ئابوریەو یاساکانی بەم جۆرەیە:

کەس خاوەنی هیچ شتێکی خۆی نیەو دەبێت سەرجەم سەرمایەی خەڵکی لەژێر دەستەڵاتی وڵاتدا بێتو خەڵکی وەك کرێکارێك کاربکاتو مانگانە بەیەکسانی موچە وەربگرێت، کەبەڕاستی ئەم جۆرە یاسا علمانیە جاهلیەش لەناوەڕۆکدا هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ یاساکانی سەردەمی عەرەبی جاهلیو (راس مالیەت)ی ئەم سەردەمە، چونکە لەیاسای ئابوری (راس مالیەت)دا تاکە کەسێك لەسەر حسابی کۆمەڵگا خۆی دەکردە سەرمایەدارو دەوڵەمەندو مافی سەدانو هەزارانیتری پێشێل دەکرد، هەروەها لەیاسای ئابوری (اشتراکیەتیشدا) دەوڵەت لەسەر حسابی کۆمەڵگا خۆی دەکردە سەرمایەدارو کەس مافی ئەوەی نەبوو کەتەنها خاوەنی پارچە زەویەکی خۆی بێت، بەڵێ ئەمە بەراوردێکی زۆر سادەو خێرابوو دەربارەی هەرسێ یاسای جاهلی (عەرەبی کۆنو راس الیەتو اشتراکیەتی نوێ) !! کەواتە چ جیاوازیەك بەدی دەکەی لێرەدا؟!

ناوەڕۆکی هەرسێ یاساکە بریتیە لەچەوساندنەوەی کۆمەڵگا بەڵام هەریەکەی بەناوێکەوە، کەواتە ئێستا گەیشتینە ئەو ڕاستیەی کەبڵێین:

((گەر ئیسلام لەسەرەتادا وەك دینێکی چارەسەرخواز لەکۆمەڵگای عەرەبی جاهلیدا پەیدابوو بۆ مەبەستی ڕاست کردنەوەی خەڵکیو ڕزگارکردنی کۆمەڵگای عەرەبیو سەندنەوەی سەرجەم مافە خوراوەکانیان، ئەوە ئێستەو لەم سەردەمەدا زۆر پێویست ترە

کەئیسلام جارێکی‌تر دروشم‌و یاساکانی خۆی لەناو کۆمەڵگای پێش کەوتووخوازوو زانست دۆستی ئەم سەردەمەدا بلاوبکاتەوەو کۆمەڵگا لەو بیردۆزو یاسا جاهلی‌و ناژەڵیانە پاك بکاتەوە هەروەك چۆن لەسەرتادا کۆمەڵگای عەرەبی جاهلی پاککردەوەو سەرجەم ئەو یاسایانەی کەهەزارانیان دەچەوساندەوە لەناوی‌بردن‌و ڕیشەکێش‌و بن کری‌کردن.

کەواتە ئێستا علمانیەکان دەڵێن چی؟! پاساوی چی بۆ بیردۆزو یاسا جاهلیەکانی خۆیان دەهێننەوە؟! بەڵگەی چی بۆ کۆن بوون‌و نەگونجانی شەریعەتی ئیسلام‌و یاساکانی بۆ خەڵکانی چەواشەو لایەن گری خۆیان باس دەکەن.

هەروەها دەربارەی فرۆشتنی بەندەو کەم دەست‌و غەریب‌و ڕەش پێستەکانیش دەڵێین: ڕاستە ئێستا بەوشێوەی کەلەسەردەمی خۆیدا هەبوو بەندە نابرێتە بازاڕوو بفرۆشرێ بەڵام ئایا فرۆشتنی بەندە تەنها لەوەدایە کەببرێتە بازاڕوو وەك ماددەی‌تر خەڵکی بیان کڕی؟! نەخێر!! ئەمڕۆ لەژێر سایەی علمانیەکاندا خەڵکی نەك لاشەی خۆی بفرۆشێ بەڵکو ڕۆح‌و لاشەو ژیانی خۆی دەفرۆشێ.

دواین قسەم لەوەڵامی ئەم خاڵەدا ئەوەیە کەبڵێم:

ئەو جاهلیەتەی کەعەرەبی ئەو سەردەمەی تێدابوو هەمان جەهالەتەکە ئەمڕۆ خەڵکی تی‌کەوتووە بەڵام بەشێوەیەکی‌ترو بەناوێکی‌تر، کەواتە ئیسلام لەم کاتەدا زۆر پێویست ترە کەجارێکی‌تر سەر لەکۆمەڵگای ئەمڕۆی جاهلی بداتەوەو یاساکانی خۆی بخاتەوەگەڕ بۆ ڕزگارکردنی خەڵکی لەو جەهالەتەی کەبەهۆی ڕێچکەو بیردۆزە ماددیەکانەوە تووشی بووە.

<u>تێبینی</u>: خوێنەری بەڕێز ئاگادار دەکەم کەسەر بدات لەکتێبی ((جاهلية في قرن العشرين)ی مامۆستای پایەبەرز (محمد قطب) تازیاتر لەجاهلیەتی ئەم سەردەمە تی‌بگات))

## یاساکانی شەریعەتی ئیسلام لەنێوان جێ‌بەجێ‌کردن‌و دروشمی خەیاڵیدا!!

پاش ئەوەی بەڵگەو پڕوپاگەندەی علمانیەکانمان هەڵوەشاندەوەو بەرپەرچمان دانەوە دەربارەی نەگونجانی شەریعەتی ئیسلام لەگەڵ ئەم سەردەمەدا (انشاء الله) ئێستا دەچینە توێژینەوەیەکی زانستی دەربارەی (یاساکانی شەریعەتی ئیسلامی لەنێوان جێ‌بەجێ‌کردن (تطبیق)و دروشمی خەیاڵیدا.

گومانی تێدانیە کەدەیان ساڵە دوژمنانی خواو عیلمانی‌و مارکسیەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کەگوایا ئیسلام بەگشتی دینێکی خەیاڵی‌یەو(وەهمی) چەند دروشمێکی بریقەدارو بەرزکراوەیەو ناتوانێت لەگەڵ ژیانی خەڵکی‌و پێشکەوتنە زانستی‌و

مرۆییەکاندا هەنگاو بنێت، وەتەنها چەند یاسایەکی کۆنەو تایبەتە بەخودی ئینسانەکان خۆیانەوەو پەیوەندی بەسیاسەت و لایەنی ئابوری و کۆمەڵایەتی و عەسکەری و زانستو.........)) نیە.

بەڵگەشیان بۆ ئەم قسانەیان ئەوەیە کەدەڵێن: ڕۆژ بەڕۆژ ژیانی خەڵکی لەبەرەو پێش چوندایەو مرۆڤ بەردەوام لەهەوڵی داهێنان و تازەگەریدا خۆی خەریك دەکات و ئیسلامیش وەك بەرد لەجێگاو شوێنی خۆیدا ماوەتەوەو قابیلی دەست کاری و گۆڕان کاری نیە، چونکە یاساکانی دینی ئیسلام یاسای قەطعین و بواری پێشنیارو ڕادەربڕینی تێدانیە.

لەبەرئەوە ئیسلام تەنها چەند دروشمێکی خەیاڵیەو هەرگیز لەجیهانی واقیعدا ناتوانێت جێگای خۆی بکاتەوەو یاساکانی خۆی بەئەنجام بگەیەنێ!!

*پێش ئەوەی وەڵامی ئەم گومانە بێناوەرۆکە بدەینەوە باشتر وایە کەبزانین کێ ئەم قسانە دەکات و تاچ ڕادەیەك لەڕاستیەوە نزیکن:*

أ) بێگومان ئەو کەسەی ئەم قسانە دەکات هیچ شارەزاییەکی لەدینی ئیسلام و یاساکانی نیەو ڕووداوەکانی مێژووی ئیسلامی نەخوێندۆتەوەو هەروەك تووتێ ئاسا فێری ئەم قسانەکراوە.

ب) یان ئەو کەسانە ئەم قسانە دەکەن کەشارەزان و باش لەئیسلام و یاساکانی حاڵیبوون بەڵام بۆ مەبەستی بەرژەوەندیەکی دنیایی خەڵکی چەواشە دەکەن و ئەم گومانانە بڵاودەکەنەوە.

ج) یان ئەو کەسانەن کە یاسا نەگۆڕو گۆڕاوەکانی ئیسلام جیاناکەنەوەو هەروا دەزانن کەئیسلام چەند یاسایەکی نەگۆڕەو بەپێی سەردەم و کاتەکان قابیلی گۆڕانکای نیە.

بەهەر حاڵ هەریەك لەم سێ تاقمە زۆر خراپ حاڵیبوون لەیاساکانی شەریعەتی ئیسلامی و مێژووی ئیسلامی و سەرجەم بوارەکانی تری ئیسلام، چونکە: .

یاساکانی شەریعەتی ئیسلامی سەرجەم بەکۆقەطعی نین و بەڵکو هەندێکیان هەیە بەپێی (شوێن و کات و ئەو شەخصە) دەگۆڕێ هەروەك زانایانی شارەزا لە زانستی (أصول الفقه) ئاماژەمان بۆ کردووەو دەڵێت (تتغیر الاحکام بتغیر الزمان والمکان والاشخاص والاحوال))

واتە: یاساکان دەگۆڕێت بەپێی ((کات و شوێن و کەسەکان و حاڵەتەکان)) بۆ نمونە لەجێگایەکدا کەخەڵکی خواردنی حەڵاڵ و ئاوی دەست بکەوێت بۆمەستی خواردن

حەرامەو بواری پێنەدراوە کە(گۆشتی بەرازو مردارەوە بوو و ئارەق بخوات) بەڵام ئەگەر ئەو کەسە ڕۆی کەوتە جێگایەك و هیچی دەست نەکەوت لەغەیری ئەو شتە حەرامانە زیاتر ئەوە لەوکاتەدا یاساکانی خوای گەورە ڕێگەی ئەوکەسەدەدەن کەئەوشتە حەرامانە بخوات بۆ مەبەستی پارێزگاری کردن لەژیانی ئەو کەسە.

**کەواتە دەتوانین یاساکانی شەریعەتی ئیسلامی بکەین بەچەند بەشێکەوە:**

أ) هەندێك لەیاساکانی شەریعەتی ئیسلامی و عەقیدەی ئیسلامی بواری دەست کاری کردن و قسە لەبارەوە کردن و ڕادەربڕینی کەسی تێدانیە چونکە لەسەرتاوە خوای گەورە حوکمەکەی بڕیوەتەوەو لەهیچ سەردەمو کاتێکدا ئەو سایانە ناگۆڕێت و تاقیامەت دەبێت وەك خۆیان وابن وەك (سەرجەم) بنچینە باوەڕییەکان، یاساکانی حەڵاڵ و حەرام، بەهاوڕەوشتی‌یەکان، شێوازی عبادەت کردن هەر لەنوێژو ڕۆژو حەج و... هتد)).

ب) هەندێکی‌تر لەیاساکانی شەریعەتی ئیسلامی بناغەکەی لەقورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) باسی لێوەکراوە بەڵام دەلیلێکی قەطعی نیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کارە بەچ شێوازێك بکرێت و بدرێت بۆ نمونە: (یاسای شورا لەئیسلامدا)) باس لەوەندەکراوە کەخوای گەورە دەفەرموێت بەپێغەمبەر (ﷺ) ﴿وامرهم شورى بينهم﴾[1] یان ﴿و شاورهم فى الامر﴾[2]

بەڵێ لەقورئاندا ئەوەندە باسی شورا کراوە کەدەبێت ئەو بڕیارانەی کەلەحکومەتێکی ئیسلامیەوە بڕیاری لەسەر دەدرێت لەسەر بناغەی شورابێت واتە (ڕاپرسی‌کردن بەچەند کەسانێکی خاوەن ژیری و لێزان لەو کارەدا).

حیکمەتیش لەم ڕون نەکردنەوەیە‌ی یاساو چۆنیەتی شورادا لەوەدایە کەئەو کەسانەی پەیامی خوای گەورەیان هەڵگرتووەو هەوڵی جێگیربوونی دینی خوا دەدەن کەکاتێ گەیشتە سەر کورسی حوکم یاسای شورا لەو حکومەتەدا بەکاربهێنن و جێبەجێی بکەن بەڵام بەپێی حاڵی ئەو سەردەمو واقیعەی کەتێیدا دەژین.

کەئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر مانەوەی دین و گونجانی لەهەموو کات و سەردەمێکدا.

---

(١) (شورای: ٣٨).

(٢) (ال عمران: ١٥٩).

ج) هەندێکی تر لەیاساکانی شەریعەتی ئیسلامی پێیان دەوترێت (ظنی الدلالة)..واتە: بەڵگەیەکی قەطعی بەدەستەوە نادات و گومانی تێدا هەیە، هەربۆیە زانایان و (فقهاء) لەچۆنیەتی دەرهێنان و (استنباط)ی حوکم لەو ئایەتانەوە جیاوازیان کەوتۆتە نێوانەوە، هەروەها ئەم جیاوازیەیان لەڕق قین و دژایەتیەوە نەبووە بەرامبەر بەیەکتری بەڵکو لەچۆنیەتی تێگەیشتنیان بووە لەو دەقە شەرعیە (جا ئایەتی قورئان بوبێت یان فەرموودەی صەحیحی) پێغەمبەر (ﷺ) زۆرجار لەدەربڕینی فتواکانیاندا ڕاستیان کردووەو پێکاویانەو زۆرجاریش نەیان پێکاوە، بەڵام پاداشتی خۆیان وەرگرتووە چونکە بەمەبەستێکی پاکەوە ئەو قسەیان کردووەو هەوڵی زۆریان لەگەڵدادا وە.

نابێت ئەوەش لەیادبکەین کەسەرجەم زانایان و مجتهدان لەسەر یاسا قەطعیەکانەوە قسەیان نەکردووەو ڕاوبۆچونی خۆیان دەربارەی نەوتووە بەڵکو زانایانی (مجتهد) (ڕەحمەتی خوایان لێبێ) لەو یاسا فەرعیانە قسەیان کردووە کەدەلیلێکی قەطعی نادەن بەدەستەوەو گومانی تێدایە، بۆ نمونە خوای گەورە دەربارەی قورئان دەفەرموێت: ﴿لا يمسه الا المطهرون﴾.. واتە: دەست نەدەن لەقورئان تا پاك نەبن، ئالێرەدا زانایان لەسەر وشەی (مطهرون) جیاوازیان کەوتۆتە نێوان، هەندێکیان دەڵێن وشەی (مطهرون) بەمانای دەست نوێژ دێت، واتە: ئەو کەسەی دەست نوێژی نەبێت دەست لەقورئان نەدات، هەندێکی تر لەزانایان دەڵێن وشەی ﴿مطهرون﴾ بەمانای (لەشت تەواو نەبێت) (جابەهۆی کاری ژن و مێردایەتیەوە بێت یان بەهۆی شەیتانەوە بێت یان بەهەربیانویەکی ترەوە بێت) کەماناکەی بەم جۆرەی لێدێت: واتە ئەو کەسەی کەلەشی پاك نەبێت دەست لەقورئان نەدات بەڵام قەیناکا دەست نوێژیشی نەبێت بەس لەشی پاك بێت.

وەدەیان و سەدان باسی تری لەم جۆرە، کەبەڕاستی ئەم مەسەلە اختلافیانەش هیچ سەرئێشەو گرفتێکی گەورەی بۆ موسڵمانان دروست نەکردووەو موسڵمان ئازادە لەوەی کەبەقسەی هەرکام لەو زانا مجتهدانە بکات.

د) هەندێکی تر لەیاساکانی شەریعەتی ئیسلام حەرامن و حوکمەکەی بڕاوەتەوە بەڵام لەناو حەرامەکاندا چەند پلەیەك هەیە، هەندێکیان زۆر بەتوندی حەرامەو بواری کردنی نیە بەهیچ بیانویەکەوەو لەهیچ سەردەمو کاتێکدا، وەك (کاری سوخۆری هەروەك قورئان دەفەرموێت: ﴿واحل الله البيع وحرم الربا﴾

واتە: خوای گەورە کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووەو کاری سوخۆری حەرام کردووە، یان داوێن پیسیکردن (زینا) کەلەهەموو سەردەم کاتو حاڵەتێکدا حەرامەو کەس ناتوانێت بۆ هیچ حاڵەتێك حەڵاڵی بکات، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ولاتقربــوا الزنــا﴾.. واتە: بەهیچ شێوەیەك توخنی زینا نەکەونو لێی نزیك مەکەونەوە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا هەندێ کاری حەرامیمان هەیە کەلەحاڵەتی پێویستدا حەڵاڵ دەکرێتو ئیسلام لەڕەحمەتو فراوانی خۆیەوە ڕێگە بەکردنی دەدات بۆ نمونە:

(ئارەق خواردن) هەرکاتێ زانیو خەریکە دەمرێت لەتینوانداو ژیانت لەدەست دەدەیتو غەیری ئارەقیش هیچ شتێکیتری لێنیە لەم حاڵەتەدا ئیسلام ڕێگە دەدات کەئەو حەرامە بخۆیتەوەو تانەمریتو دەگەیتە ئاوەدانیەك بۆ بەدەست خستنی ئاوی پاكو حەڵاڵ، هەروەها گۆشتی بەرازو مردارەوەبوو و شتەکانیتر کەژیانی ئینسانی لەسەر بەندە هەمان یاسای هەیە.

مەبەستیش لەم کارە تەنها پاراستنی ژیانی خەڵکەو هیچیتر نییە.

کەواتە لەخاڵی یەکەمدا ڕون مان کردەوە کەسەرجەم یاساکانی شەریعەتی ئیسلامی بەڵگەی قەطعی نادەن بەدەستەوەو بواری اجتهادو مناقشەو ڕادەربڕینیشی تێدایە بۆ زانایان تابتوانن دین لەگەڵ ژیانی خەڵکیدا بگونجێننو بەپێی ئەو سەردەمو واقعەی کەتێیدا دەژین فتوا بدەن.

علمانیەکان دەربارەی ئەم خاڵە زۆر بەهەڵەداچوون چونکە ئەوان دەڵێن ئینسان دروست کراوێکە بەردەوام لەگۆڕاندایە، هەروەها یاساکانی شەریعەتی ئیسلامیش هەمووی جێگیرن، کەواتە یاسا جێگیرو بڕیار لەسەر دراوەکانی ئیسلام لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی ژیانی انساندا ناگونجێت.

ئێمەش دەڵێین علمانیەکان لەم خاڵەدا زۆر بەهەڵەداچوون چونکە: نەهەموو ژیانی ئینسان قابیلی ئەو گۆڕانکاریانەو نەهەموو یاساکانی ئیسلامیش جێگیرن، بەڵکو هەندێ لایەنی ژیانی انسان هەیە جێگیرەو هەرگیز قابیلی گۆڕان نیەو وەك (فطرەت، اخلاق، پەیوەندی کۆمەڵایەتی، کاری چاکەخوازیو گیانی هاوکاریو برایەتی...)) یاساکانی ئیسلامیش لەم کارانەدا جێگیرەو قابیلی گۆڕان نیە، هەروەها هەندێ لایەنیتری ژیانی انسان هەیە قابیلی گۆڕانە بەپێی کاتو سەردەمەکان هەربۆیە هەندێ لەیاساکانی شەریعەتی ئیسلامیش قابیلی گۆڕانکاریە لەگەڵ گۆڕان کاریەکانی هەروەك زانایان دەڵێن: ((تتغیر الاحکام بتغیر الزمان والمکان والاشخاص)).. واتە: یاساکان دەگۆڕێن بەپێی کاتو شوێنو کەسەکان)).

## چەند تایبەت مەندیەك لەبناغەكانی یاسای شەریعەتی ئیسلامی

***بێگومان یاساكانی شەریعەتی ئیسلام چەند تایبەت مەندیەكی سەرەكی هەیە كەبەهۆی ئەم تایبەت مەندیانەوە دەگونجێت بۆ هەموو سەردەمو كاتێك تاڕۆژی دوای كەسەرەكی‌ترین یان ئەمانەن:***

**١) نەبونی قورسیو مەشەقەت لەشەریعەتی ئیسلامدا:**

**٢) گەربەووردی سەیرێكی سەرجەم یاساكانی شەرعەتی ئیسلامی بكەین ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەكەوێت كەیاساكانی خوای گەورە زۆر نەرمو نیانیو ئاسانی پێوەدیارە:**

هەروەك قورئان دەفەرمێت:

﴿مایرید الله لیجعل علیكم من حرج﴾ (المائدة: ٦).

واتە: پەروەردگار نایەوێت كەكاری قورسو حەرەجتان لەسەر دروست بكات.

یان دەفەرموێت: ﴿یرید الله بكم الیسر ولایرید بكم العسر﴾ (البقرة)

واتە: خوای گەورە كاری ئاسانو سوكی لێتان دەوێتو شتی قورسی لەئێوە ناوێت، هەروەها (عائیشە)ی دایكی باوەڕداران دەفەرموێت:

((ماخیر رسول الله (ﷺ) بین امرین الا اخذ أیسرهما مالم یكن اثما فان كان اثما كان أبعد الناس منه)).[1]

واتە: هەركاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لەنێوان دووكارەدا اختیاركرابێت بۆ مەبەستی بەئەنجام گەیاندنی ئەوە كامیان سوكو ئاسان بوبێت ئەویانی هەڵبژاردووە بەمەرجێ تاوان نەبوبێت، خۆئەگەر تاوانیش بوبێت ئەوە لەهەموو كەسێ زیاتر دووربووە لێوەی.

بەڵێ یاساكانی شەیعەتی ئیسلام لەگەڵ تواناو ووزەی مرۆڤەكاندا بڕیاری لەسەردراوەو تەنها یاسایەكمان نیە لەئیسلامدا كەلە تواناو ووزەی مرۆڤەكاندا نەبێتو ئەنجام نەدرێت، هەربۆیە خوای گەرو دەفەرموێت:

﴿لایكلف الله نفسا الا وسعها﴾ (البقرة) .

واتە: خوای گەورە داوای شتێكتان لێناكات كەلەتواناتاندا نەبێت.

یان دەفەرمێت: ﴿لیس علی الاعمی حرج ولاعلی الاعرج حرج ولا علی المریض حرج﴾ (الفتح: ١٧)

---

(١) رواه مسلم.

هەروەها ئیسلام لەڕوانگەی ئاسانیو سۆزی خۆیەوە ڕێگەی (داوە) بەڕۆژوان لەمانگی ڕەمەزاندا کەبەڕۆژو نەبێتو لەپاش ڕەمەزان بیگرێتەوە، ڕێگەی داوە بەکورت کردنەوەو پێش خستنو کۆکردنەوەی نوێژی نیوەڕۆ عەسر(قصر وجمع وتقدیم) کاتی لەسەفەردایت، هەروەها بواریداوە بەخواردنی گۆشتی بەرازو ئارەق لەکاتی زۆر تەنگانەدا بۆ مەبەستی پاراستنی ژیانی انسانەکان.

٣) کەم کردنەوەی تەکلیفەکان (تقلیل التکالف):

هەروەها یەکێکیتر لەتایبەت مەندیەکانی یاسای شەریعەتی ئیسلامی بریتییە لەوە کەزۆرجار و لەهەندێ حاڵەتدا خوای گەورە ئەو داواکاریانەی کەلەسەر مرۆڤەکان پێویستی کردووە کەمی دەکاتەوەو ئاسانی دەکات بۆ مەبەستی ئەوەی ئەو کەسانە توشی ژیانی ناخۆشو ناڕەحەتیو حەرەج نەبن هەروەك لەوەو پێش لەخاڵی یەکەمدا باسمان کرد.

بۆ نمونە حەج کردن کەیەکێکە لەپێنج پایەکەی ئیسلامو واجبە لەسەر باوەڕداران، بەڵام لەهەمان حاڵەتیشدا لەسەر یەکێ واجب نیە کەتوانای نەبێت یان زەکاتو سەرفیترەو خێرو شتەکانیتر، یان خوای گەورە دەربارەی نوێژ دەفەرموێت: ﴿واقم الصلاة﴾..واتە: نوێژ بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا بەپێوە ڕابوەستن (کەیەکێکە لەمەرجەکانی نوێژ) بەڵام لەحاڵەتی نەخۆشیو بێتوانایدا ئیسلام ڕێگەیداوە کەبەدانشتانەوە نوێژبکرێتو، خۆئەگەر نەشت توانی ئەوە بەپاڵکەوتنەوە نوێژەکەت بکەوە بەم شێوەیە.

یان جیهادکردن کەیەکێکە لەفەرمانەکانی خوای گەورە بەڵام لەهەمان حاڵەتیشدا (جیهادکردن) لەسەر یەکێ واجب نیە کە (نەخۆشو لاوازو پەك کەوتەبێت یان منداڵ یان هەرشتێکیتر بێت لەم بابەتە).

٤) یاسای پلەپلە (تدرج) هەیە لەشەیعەتی ئیسلامدا:

یەکێکیتر لەتایبەت مەندیەکانی شەریعەتی ئیسلام بریتیە لەوەی کاتێ خوای گەورە یاسایەکی داناوەو بڕیاری لەسەر داوە پلەپلە ئەوفەرمانە دابەزیوە چونکە ئەگەر بێتو لەسەردەمی خۆیدا بەیەك جار سەرجەم یاساکانی خوای گەورە بهاتایە خوارەوە ئەوە لەوحاڵەتەدا زۆر قورس دەبوو لەسەر موسڵمانانو جۆرە قورسیەکی بۆ دروست دەکردنو هەرگیز نەیان دەتوانی جێبەجێی بکەن، هەربۆیە قورئان لەماوەی (٢٣) ساڵدا هاتەخوار بەپێی ڕوداوەکان، یان حەرام کردنی ئارەق کەبە (سێ)جار حەرام کراو لەهەر حاڵەتێکیاندا بەشێك لەئارەق حەرام دەکراو موسڵمانانیش بەپەیڕەی باوەڕەوە وازیان لێدەهێناو تەرکیان دەکرد.

بەڵێ ئەمە بەشێکی زۆر کەم بوو لەتایبەت مەندیەکانی شەریعەتی ئیسلامی کەئەم تایبەت مەندیانە لەهیچ دینو بیردۆزێکی‌تردا بەدی ناکرێت.

کەبێگومان ئەم تایبەت مەندیانە تەنها لەئیسلامدا بەدی دەکرێت و لەگەڵ هەموو سەردەمو کاتێکدا دەگونجێت.

کەواتە ئێستا لەدوای ئەم ڕون کردنەوەیە علمانیەکان بەڵگەی چی دەهێننەوە بۆ نەگونجانی شەریعەتی ئیسلام لەگەڵ انسانو ڕۆژگاردا؟!

## نمونەی چەند تاقیکردنەوەیەکی مێژووی لەجێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامدا

علمانیەکان دەڵێن: ئەی بانگ خوازانی ئیسلام؟ ئەی ئەو کەسانەی کەبانگەشە دەکەن بۆ جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی؟! ئەو ئیسلامەی لەچەند دروشمێکی خەیاڵی پێکهاتووەو هەرگیز ناتوانێت لەدنیای واقعدا خۆی بنوێنێ؟!

ئەو ئیسلامەی ئێوە بانگەشەی بۆ دەکەن تەنها لەسەردەمی پێغەمبەرو خولەفاکانی دوای ئەودا جێبەجێکراو بەلەناوچونی ئەوان ئیسلامیش تیاچوو.

هەروەها مێژووی ئیسلامی پڕیەتی لەچەند محاوەلەیەکی بێبەرهەمو فاشلو هیچی‌تر (وەدەیانو سەدان قسەو باسی تری لەم بابەتە.

بەڵێ علمانیەکان بەدروست کردنی ئەم جۆرە گومانو درۆ بێناوەڕۆکانە توانیان خەڵکێکی زۆر چەواشەبکەنو بیان کەنە دژی ئیسلام بەلام واقع خۆی وەلامی ئەم درۆو قسە پوچانەیان دەداتەوەو دەڵێت:

ئەی علمانیەکان زۆر بەهەڵەداچوون کاتێ وادەڵێنو ئەو درۆو گومانانە بلاودەکەنەوە چونکە شەریعەتی ئیسلامی وەك لەوەوپێش باسکرا چەند تایبەت مەندیەکی تایبەتی هەیەو بەهۆیەوە لەهەموو سەردەمو کاتێکدا جێبەجێ دەکرێت، بەڵێ گەر ئیسلام دینێکی خەیاڵی بوایەو تەنها دروشمو قسەی زل بوایە دەبوو تەنها بۆ جارێکیش جێبەجێنەکرێت لەدنیای واقعدا بەلام گەر سەیرێکی مێژوو بکەین ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت، بەڵێ ئیسلام لەشوێنێکدا جێبەجێکرا کەدواکەوتوترین شوێن بوو لەناوچەکەداو لەو سەردەمەدا کەئەویش مەککەو مەدینەو دەورگەی عەرەبی بوو پاشان بۆ ناوچەکانی‌تری جیهان.

پاشان دوورگەی عەرەبی لەسەردەمی خۆیدا لەهەموو ڕویەکەوە دواکەوتووبوو و ئاستی ڕۆشنبیری و خوێندەواری یان زۆرکزو لاوازبوو؛ هەربۆیە قورئان لەناویاندا هاتەخوارەوە بۆ مەبەستی هۆشمەندکردن و وریاکردنەوەیان وەك دەفەرموێت:

﴿انا انزلنا قراناً عربيا لعلكم تعقلون﴾

واتە: ئێمە ئەم قورئانە عەرەبیەمان ناردۆتە خوارەوە بۆ ئەوەی ((ژیرو عاقڵ بن))

بەڵێ گەر قورئان و شەریعەتی ئیسلامی لەکۆمەڵگایەکی وادواکەوتوودا جێبەجێکرابێ ئەی چۆن لەکۆمەڵگایەکی شارستان و پێش کەوتودا جێبەجێ ناکرێ؟!

لەم کاتەدا ڕەنگە هەندێك هەبن کەبڵێن: ئیسلام لەبەرئەوەی دینێکی لاوازو سادەو ساکارە بۆیە توانیویەتی لەناو کۆمەڵگای عەرەبی دواکەوتو نەخوێندەواری ئەو سەردەمەدا جێی خۆی بکاتەوەو جێبەجێ بوبێ؟! ئێمەش بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ژەهراویە دەڵێین:

<u>بۆ نمونە</u>: گەر مامۆستایەکی زیرەك و لێهاتوو توانی چەند قوتابیەکی سادەو ساکارو نەخوێندەوار بکاتە مامۆستاو کەسانی خوێندەوار! ئەوە مانای ئەوە دەگەیەنێ کەئەم مامۆستایە زۆر لێزان و زیرەکەو دەتوانێت کەسانی زیرەك و خاوەن ژیری زیاتر پێبگەیەنێت و فێری خوێندن و نوسینیان بکات ئەوە زۆر ئاسانتر دەتوانێت کەکەسانی خاوەن ژیری و خوێندەوار پێبگەیەنێ.

بەڵێ: ئیسلام کۆمەڵگایەکی پەروەردەکرد کەنەخوێندەوار بوون و بت پەرست بوون و مافی لاوازو کەم دەست و ئافرەتیان نەدەداو انسانی لاوازو ڕەش پێست و غەریب لەبازاڕەکاندا دەفرۆشران و سەدان و هەزاران سیفەتی دزێوی تریان تێدابوو، بەڵام پاش گەیشتنی نووری ڕوناکی ئیسلام بەو کۆمەڵگا جاهلیە، سەرجەم ڕوداوەکان پێچەوانەبونەوەو ئەوانەی دارو بەردیان دەپەرست بونە یەکتاپەرست و تەنها خوایان دەپەرست و، ئەوانەی نەخوێندەوار بوون توانیان ببن بەمامۆستای عەرەب و غەیری عەرەب و، ئەوانەی ژێر دەستەبوون ئازادبوون و لەپاشاندا جیهانیان ئازادکرد.

پاشان ئەو عەربە نەخوێندەوارو نەفامانەی کەوەك دڕندە دەژیان، ئیسلام کردنی بەشوان و پێشەنگی مرۆڤایەتی و سەرجەم خەڵکانی دنیا بە(ئەورووپا)شەوە (دین و زانست و فەلسەفەو هونەرو سەرجەم تاقیکردنەوەکانی ژیانیان لەمانەوە وەردەگرت و لەووڵاتانی خۆیاندا تەجروبەی موسڵمانەکانیان جێبەجێ دەکرد.

بەڵێ ئیسلام نەك تەنها لەسەردەمی پێغەمبەرو چوار خەلیفەکەی دوای خۆیدا جێبەجێکرا وەك علمانیەکان دەڵێن! بەڵکو (١٣) سەدە دوای ئەوانیش بەردەوام بوو کەیەکەم دینو یەکەم بەرنامە لەسەر زەویدا بەدرێژای مێژوو توانیبێتی کەبۆ ماوەی (١٣٠٠) ساڵ بەردەوام بوبێتو خۆی گرتبێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەزاران نەخشەو پیلان دژیکراوەو فتنەو شەڕی تێدا بلاوکرایەوە کەجەنگی علی کوڕی ابی طالب و معاویە (ڕەزای خوایان لێبێت) باشترین نمونەی ئەم ڕاستیەن بەلام لەگەڵ ئەمەشدا بانگەوازو شارستانیەتی ئیسلامی ئەوەندە گەورەو فراوان بوو ئەم ڕوداوە بچوکانە هیچ کاریگەریەکی نەکردە سەر بلاوبونەوەی ئیسلام.

بەڵێ ئەمە وەلامی واقع بوو دژی علمانیەکان، کەواتە ئێستا دەڵێن چی؟! بەچ بەڵگەو بیانویەك دەڵێن مێژووی ئیسلامی پڕیەتی لەمحاولەی بێبەرهەمو فاشل؟ هەموو دەزانین گەر بەرنامەیەك لەدنیادا فاشل بێتو لەگەڵ ویستی خەڵکیدا نەبێت ئەوە تەنها چەند ساڵێکی کەم دەتوانێت بەردەوام بێتو جێگیر بێت، بەلام لەپاشاندا خەڵکی خۆی شۆڕش دەکات بەسەر ئەو بەرنامەداو لەناوی دەبات، شۆڕشی فەرەنسا لەدژی پیاوانی کەنیسەو شۆڕشی خەڵکی ڕوسیا لەدژی مارکسیە شیوعیەکانو شۆڕشی بەعسیەکان دژی عبدالکریم قاسمو شۆڕشی کوردەکان دژی بەعسیەکان لەساڵی ١٩٩١، باشترین بەڵگەی زیندون بۆ ئەم باسە.

سەرنجێك! کاتێ علمانیەکان قسەدەکەن دەدوێن دەربارەی ئیسلام کە ئیسلام خەیاڵیەو لەدروشمو قسەی زلو بێناوەڕۆك زیاتر هیچیتر نیە!!؟.

لێرەو لەم کاتەدا زۆر بەپێویستی دەزانم کەئەوە ڕون بکەمەوە ئاخۆ چ کاتێك بەدینێك یان بەرنامەو بیردۆزێك دەوترێت خەیاڵی یان پرسیار بکەینو بڵێین:

ئایا بیردۆزو بەرنامەکانی دنیا بەهۆی چ تایبەت مەندیەکیانەوە دەبنە بەرنامەو دینو بیردۆزێکی خەیاڵیو تەنها لەچوارچێوەی قسەی زلو دروشمی بریقەدارو بێناوەڕۆکدا دەمێنێتەوە؟!

لەوەلامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین:

((هەر دینو بیروباوەڕو بیردۆزێك چ لەکۆنو لەنوێ ئەم چەند سیفەتەی تێدابوو ئەوە بەو بەرنامەیە دەوترێت بەرنامەو بیردۆزێکی خەیاڵیو بەهیچ بەڵگەیەك لەجیهانی واقعدا جێبەجێ ناکرێتو تەنها دروشمی ڕەونەق دارەو هیچیتر نیە، کەسەرکیترینیان ئەمانەن:

١ - هەر ڕێبازو بەرنامەیەك لەیاساو بیروباوەڕەكانیدا لەگەڵ فیطرەتو ناخی مرۆڤەكاندا نەگونجاو دژایەتی لەگەڵ لایەنە ناوەكیو دەرونیەكانی مرۆڤدا هەبوو ئەوەبەو بەرنامەو بیردۆزە دەوترێت بەرنامەیەكی خەیاڵیو دوابڕاوو بێبەرهەم، وە هەرگیز لەجیهانی واقعدا ناتوانێت بچەسپێت.

بەڵێ بەپێی ئەم یاسایەی سەرەوە بۆمان دەردەكەوێت ئاخۆ ئیسلام دینێكی خەیاڵیو بێناوەڕۆكەو لەگەڵ ژیانی انساندا ناگونجێت یان علمانیەت؟!

لەوەو پێش باسمان كرد كەئیسلام سەرجەم لایەنەكانی ژیانی انسانی ڕون كردۆتەوەو یاسای تایبەتی بۆ داناوە، هەروەها سەرجەم یاساو بڕیارەكانی ئیسلام لەگەڵ فطرەتی خەڵكیدا یەكسانەو بچوكترین دژایەتیان لەنێواندانیە، پاشان ئیسلام یاساكانی حەڵاڵو حەرام لەگەڵ ڕەوشتو خودی كۆمەڵگا بەگشتیو تاكە كەسەكان بەتایبەتی داناوە، هەر شتێك پاكو سودبەخش بێتو دووربێت لەزیان ئیسلام حەڵاڵی كردووەو هەرشتێك پیسو زیان بەخش بێت ئیسلام حەرامی كردووە ((واحل لكم الطيبات وحرمت عليكم الخبائث)) بەڵام گەر سەیرێكی بیردۆزی علمانیەت بكەین ئەوە دەبینین كە یاساو بڕیارەكانی علمانیەت لەگەڵ فطرەتو دەرونی مرۆڤەكاندا ناگونجێتو ڕێچكەیەكی خەیاڵیین چونكە:

ئینسان لەناخو فطرەتیدا خۆزگەی پەرستنی تێدایەو حەزبەم لایەنە دەكات، بەڵام علمانیەت هیچ بایەخێكی پێنادات‌و بەمەبەستی گرنگی مرۆڤەكانی نازانێت.

كەواتە لەم خاڵەدا علمانیەت پێكهاتووە لەخەیاڵاتو دروشمی بریقەدارو لەدنیای واقعدا جێبەجێ ناكرێت تاسەر.

٢. هەر بەرنامەو دینو بیردۆزێك لەدنیادا گەر نەیتوانی جێگیرببێتو بۆ ماوەیەكی زۆر دەستەڵات دارو حوكم ڕان بێت ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەئەو بەرنامەو دینو بیردۆزە خەیاڵیەو تەنها دروشمەو قسەی زل.

هەموو علمانیەكان دەزانن‌و لەمێژووی ئیسلام شارەزان كەئیسلام تاكە بەرنامەو دینە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا كە (١٣٠٠) ساڵ حوكمی كردبێتو فەرمان ڕەوابووبێتو گەورەترین شارستانیەتو زانستو لایەنی ڕۆشن بیریو فەلسەفیو هونەری بڵاوكردبێتەوە، وە هۆكاری كزبوونو لاوازبونی لەسەردەمی عوسمانیەكاندا دەگەڕێتەوە بۆ شوێن كەوتوانوو هەڵگرانی كەلەڕێگە پاكەكەی ئیسلام لایان داو دەستیان دایە دنیا

پەرستی، هەر بۆیە لەم کاتەدا جولەکەش دەستی خیانەت کارو پیسی خۆی تێکردن و لەساڵی (١٩٢٣) خەلافەتی عوسمانی لەناوچوو.

بەڵێ ئەوە مێژووی جێگیربوون و فەرمان ڕەوای موسڵمانان، بەڵام ئایا علمانیەت چەند ساڵە هاتونەتە سەر شانۆی ژیان و خەباتی سیاسی و فیکری خۆیان دەکەن؟! وەئایا تاچ ڕادەیەك توانیویانە کەجێگەی خۆیان بکەنەوە لەدڵی جەماوەری خۆیاندا، وەتا چ ئاستێك توانیویانە کەسەرکەوتووبن؟!

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە دەچینە خزمەت واقع بائەو شاهیدمان بۆ بدات و بڵێت ((علمانیەکان لەدوای شۆڕی فەرەنساوە پەیدابوون ساڵی (١٧٨٩) زاینی کەتا ساڵی (١٩٩٨) نزیکەی (٢٠٩) ساڵ دەکات، وەباشترین و سەرەکی ترین شوێن بۆ جێبەجێکردنی بیردۆزی علمانیەت بریتی یە لە (تورکیا)).

بەڵێ علمانیەکان لەتورکیا نزیکەی (٧٠) ساڵ حوکم یان کردوو مێشکی خەڵکیان پڕکرد لەدروشم و فکری علمانی و لەسەرجەم بەها ڕەوشتیەکان دایان ڕنی، بەڵام ئایا توانیان کەدین لەناوبەرن و بەتەواوی جێی خۆیان بکەنەوە لەناو دڵی خەڵکانی تورکیدا؟! نەخێر، لەپاشاندا خەڵکی دین دلری بەنج کراو لەدروشمە خەیاڵی و بریقەدارەکانی علمانیەت ووریابونەوەو بۆ جارێکی تر ئیسلامیان هەڵ بژاردوو علمانیەت و ڕێچکەکانی تریان پشت گوێخست. مشتێکیش نمونەی خەروارێکە.

٣. هەر بەرنامەو بیردۆزو دینێك لەدنیادا گەر تاماوەیەکی دیاریکراو خەڵکی شوێنی کەوت و پاشان لێی پاش گەزبویەوەو دژی وەستاو هەوڵیدا کەخەڵکانی تریشی لێدووربخاتەوە ئەوە گومانی تێدانیە کەئەو بەرنامەو بیردۆزو دینە تەنها قسەی زل و بریقەدارەو سەرجەم بڕیارو بۆچوونو یاساکانی خەیاڵین و هەرگیز لەدنیای واقعدا ناتوانێت جێگیربێت.

بەڵێ گەر بەپێی ئەم یاسای سەرەوە (ئیسلام و سەرجەم بەرنامەکانی تری دنیا، بەراوردبکەین ئەوە دەگەینە ئەنجامێکی واقعی.

وا بۆ نزیکەی (١٤٠٠) ساڵ زیاترە ئیسلام پەیدابووە نزیکەی (١٣٠٠) ساڵیش فەرمان ڕەواو دەستەڵات داربووە، لەگەڵ ئەم مێژووە گەورەو بێوێنەیەشدا ڕۆژێك لەڕۆژان بەرنامەیەکی تر پەیدانەبوو کەببێتە بەدیلێك بۆ ئیسلام و خەڵکی دەست لە ئیسلام بەربدەن و بچنە ناو ئەو بیرو بەرنامەیەوە، هەروەها ئەو کەسانەی کەشاددەبون بەئیسلام و دەهاتنە ناو ئیسلامەوە ئەوەندە ئاشقی بەرنامەی خوا دەبون کەخۆیان و ماڵ و ژیانیان بەخت دەکرد لەپێناوی خواداو دەیان و سەدان وولات و شاریان دەکرد بۆ مەبەستی گەیاندنی ئەو دینە بەخەڵکی.

پاشان ئیسلام ڕۆژ بەڕۆژ خەڵکی زیاتر ئاشنادەبێت پێی و لەحەقیقەتەکانی تێدەگات، هەربۆیە ئەمڕۆ لەسەدەی (٢٠)ەمدا ڕابوون و بانگەوازی ئیسلامی هەموو جیهانی گرتۆتەوەو بوەتە بەدیلێکی واقعی لەبەرامبەر علمانیەت و سەرجەم دین و ڕێچکە دەست کردەکانی تردا، هەروەها ئەمڕۆ زۆر بەئاشکرا ئەو دیاردەیە بەدی دەکەین کەخەڵکی چۆن واز لەبیروباوەڕو بیردۆزە مادیەکان دەهێنێ و باوەش دەکات بەئیسلامدا.

بەڵێ ئەمە نمونەیەکی واقعیە دەربارەی ئیسلام و شوێن کەوتوانی، خۆ ئەگەر ئیسلام دینێکی خەیاڵی و چەند دروشمێکی بریقەدارو نابەجێ بوایە ئەوە هەر لەمێژەوە باوی نەدەماو خەڵکی لێدوردەکەوتەوە وەك دینە دەست کاریکراوو بیردۆزە فشەڵەکانی تری لێدەهات، بەڵام ئایا شوێن کەوتوانی لێی ڕادەکەن و باوەش بەبەرنامەی تردا دەکەن؟! بێگومان واقع خۆی وەڵامی بۆ ئەم پرسیارانە داناوەو دەڵێت: ((نەخێر)) بەڵکو سەرجەم دین و بەرنامەو بیردۆزەکانی تری غەیری ئیسلام خەیاڵین و تاماوەیەکی کەم برەوکەن و خەڵکی شوێنیان دەکەوێت و پاش ماوەیەك شوێنکەوتوانی لێی سارددەبنەوەو پاشگەز دەبنەوەو دێنە ناو ئیسلامەوە، بێگومان ئەو بەرنامەو دینە دەست کاریکراوانەش بریتین لە:

(دینی جولەکە، دینی خاچ پەرستی مەسیحی، علمانیەت، مارکسیەت وجودیەت، عەبەسیەت، هەردوو بیردۆزی داروین و فرۆید...) کەئەم دین و بەرنامەو بیردۆزانە هەندێکیان لە (٥٠ تا ٦٠) ساڵ زیاتر نەیتوانی بەردەوام ببێت و خەڵکی لەخۆی خریکاتەوەو پاشان کەدەرکەوت بۆ خەڵکی هیچ نین و تەنها چەند دروشمێکی زل و بێناوەڕۆکن شوێن کەوتوانی لێپاش گەزبونەوەو ئەوانیش. واتە ئەو بەرنامانە ناویان لەکولەکەی تەڕدا نەماو وەك مۆم توانەوە؟؟!

بەڵێ خوێنەری بەڕێز ئەوە ئیسلام و ئەوە بەرنامەو دینەکانی غەیری ئیسلام بەراوردێکی خێراو بەویژدان بکە تابگەیتە ئەو ڕاستیەی ئاخۆ کامیان خەیاڵین و لەگەڵ ژیان و بوارەکانی پێشکەوتنی مرۆڤەکاندا ناگونجێن.

## حوکمی ئیسلام دەربارەی علمانیەت و علمانیەکان

*گەر یەکێ پرسیار بکات و بڵێت کاتێ ئێمە بۆمان دەرکەوت کەعلمانیەت چیەو ئاخۆ دەبێت حوکمی ئیسلام چیبێت دەربارەی ئەم ڕێچکە دور لەخوایە؟!*

*ئێمەش بۆ وەڵامی پرسیارەدەڵێین:*

١- علمانيەت لەڕوانگەی ئیسلامەوە بیردۆزێکە لەسەر بناغەی دنیا پەرستیو وازهێنان لەژیانی دوارۆژ دروست بووە:

هەروەها علمانیەتو سەرجەم بەرنامەکانی تر بەرێکەیەکی سەرەکی دەزانین بۆ دورخستنەوەی خەڵکی لەدینی بێگەردو بەرزی ئیسلام، کەئەم کارە ئیشی نەیارانە بە ئیسلام هەروەك قورئان باسی ئەم ڕاستیەمان بۆ دەکات لەسەر زمانی شەیتانەوەو دەفەرموێت:

﴿لأقعدن لهم صراطك المستقيم﴾ (الاعراف: ١٦).

واتە: بەڵێن بێت لەسەر ڕێگە ڕاستەکەی تۆ بۆیان دابنیشم.

پاشان دەفەرموێت: ﴿ولأغوينهم أجمعين﴾.

واتە: پاش ئەوەی کەلەسەر ڕێگە ڕاستەکەی تۆ بۆیان دانیشتم دەبێت گومڕایان بکەمو لەدینی تۆیان دوربخەمەوە.

بەڵێ علمانیەتیش وەك ڕێچکەیەکی شەیتانی ئەمڕۆو لەم سەردەمەدا هەمان ئیشی شەیتان ئەنجام دەداتو خەڵکی بۆ بێباوەڕیو بت پەرستیەکی نوێ بانگ دەکاتو لەخوای گەورەو ئیسلامیان دوردەخاتەوە.

هەربۆیە خوای گەورە ئامۆژگاری باوەڕداران دەکاتو دەفەرموێت:

﴿وان هذا صراطي مستقيما فاتبعوه ولاتتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبله ذالكم وصاكم به لعلكم تتقون﴾.

واتە: ئەمە ڕێگەی ڕاستی منە. واتە ئیسلام و شوێنی بکەونو شوێنی ڕێبازو ڕێچکەکانیتر مەکەون چونکە لەڕێگە ڕاستەکەی ئیسلام لاتان دەدەنو دورتان دەخەنەوە، بەڕاستی ئەمە وەسیەتو ئامۆژگاری پەروەردگارە بۆ ئێوەی باوەڕدار تاوەکو خۆتان لەو ڕێگایانەی شەیتان بپارێزنو دورە پەرێزبن لێیان.

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ومن يبتغ غير الاسلام دينا فلن يقبل منه وهو فى الاخرة من الخاسرين﴾ (آل عمران:٨٥)

واتە: هەرکەسێ شوێن غەیری ئیسلام بکەوێتو بەیاساو بڕیارەکانی ڕازیبێت ئەوە خوای گەورە لێی قبولْ ناکاتو لەپاشەڕۆژدا یەکێ دەبێ لەخەسارەوەمەندەکان.

٢- حوکمی ئیسلام دەربارەی علمانیەکان:-

بێگومان حوکمی ئیسلام دەربارەی ئەو علمانیانەی کەباوەڕیان تەنها بەژیانی دنیا هەیەو ژیانی دوارۆژیان پشت گوێ خستووەو باوەڕیان وایە کەدەبێت ئیسلام لەسەرجەم بوارەکانی ژیانی خەڵکیو سیاسەتو حوکم دوربخرێتەوەو دین تەنها وەك چەند دروشمێکی بەرزکراوە بمێنێتەوەو تێکەڵ بەژیانی خەڵکی نەبێت، ئەوە حوکمی ئیسلام

دەربارەی ئەو کەسانە بریتیە لەوەی بەکافرو بێدین و بێباوەڕیان دەزانین و کاتێ مرد یش نابێت نوێژی مردویان لەسەر بکرێت و لەناو گۆڕستانی موسڵمانان بنێژرێن بەتایبەتی ئەو کەسانەی کەڵپرسراوو حاکمن لەناو علمانیەکاندا.[1]

هەروەها ئەو علمانیانەی کەبانگەشە بۆ علمانیەتی خۆیان دەکەن و دەبنە بەربەست لەبەردەم جێبەجێبوون و جێگیربوونی شەریعەتی ئیسلامی، ئەوانە بەپێی حوکمی ئیسلام (هەڵگەڕانەوە لەدین) واتە (مرتەدن).[2]

ئامۆژگاری! لەکۆتاباسی ئەم بەندەدا داواکارم لەسەرجەم خەڵکی بەگشتی و ئەو کەسانەی شوێن علمانیەت کەوتون بەتایبەتی ئەوەیە کەبگەڕێنەوە بۆلای ئیسلام، بەڵێ بۆلای ئەو ئیسلامەی کەلەداهاتویەکی نزیکدا سەرتاپای جیهان دەگرێتەوەو جارێکیتر خەلافەتی قورئان لەسەر زەویدا بەڕێوەدەچێ هەروەك نزیکەی (١٣٠٠) ساڵ بەڕێوەچوو.

ئەو ئیسلامەی کەلەلایەن ئەو پەروەردگارەوە دانراوە کەدروست کەری سەرجەم بونەوەرەو لەسەرو هەمووشیانەوە ئینسان.

تاکەی ژیانی گەنجێتی و لاوێتی خۆتان لەگەڵ ئەم ڕێچکەو ئەو بیردۆزدا سەرف دەکەن و ناگەڕێنەوە بۆ ڕەحمەت و باوەشی گەرم و پڕ دڵسۆزی ئیسلام.

تازووە بگەڕێنەوە بۆلای خوای گەورە چونکە ژیانی کەمی دنیا هەرچۆنێك بێت و لەگەڵ هەرکەسێکدا بێت هەرتەواو دەبێت، کەواتە واباشترە لەگەڵ کۆمەڵێکدا ژیان بەسەربەری کەلە ڕۆژی دوایدا ڕزگارت بکەن نەك پشتت تێبکەن، خۆشەویستان دڵنیابن لەوەی کەعلمانیەتیش هەروەك مارکسیەت و عەبەسیەت و وجودیەت و ڕێچکە بێدین و خوانەناسەکانیتر هەر ڕۆژێك بێت لەناودەچێت و باوی نامێنێت، ئەی تۆی شوێن کەوتوی علمانی لەوکاتەدا پاساوی چی بۆخۆت دەهێنیتەوە؟! ئەوکاتە شوێن کێ دەکەوی؟!

پاشان لەڕۆژی دوایدا چۆن و بەچ جۆرێك وەڵامی پەروەردگارت دەدەیتەوە کاتێك لێت دەپرسێ! بۆ شوێن دینی من نەکەوتی و بۆچی علمانی بویت و دژی دین و بەرنامەی من دەوەستای؟!

کەواتە بەخۆتدا بچۆرەوەو بزانە ڕاست ترین بەرنامەو یاسای ژیان کامەیە شوێن ئەوە بکەوە!! والسلام علیکم ورحمه الله وبرکاته.

١٩٩٨/٥/٢٤

(١) ظاهرة الغلو في التكفير: د.یوسف القرضاوی (ص: ٢٠،٢١)

(٢) الاسلام والعلمانية وجها لوجه (د. یوسف القرضاوی (ص: ٧٥).

# سەرچاوەكان

١- الاسلام والعلمانية وجها لوجه.......................... د.يوسف القرضاوى

٢- مذاهب فكرية معاصرة........................................ محمد قطب

٣- الجداول الجامعة فى العلوم النافعة.......... جاسم بن محمد بن مهلهل

٤- ظاهرة الغلوفي التكفير...................................... د.يوسف القرضاوى

٥- الموسوعة الميسرة فى الاديان والمذاهب

المعاصرة........................ الندوة العالمية للشباب الاسلامى

٦- كيف نكتب التأريخ الاسلامى........................................ محمد قطب

٧- نفحات من شريعة الاسلامية................................ ابراهيم نعمة

٨- ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين........................ أبو الحسن الندوى

٩- المؤمرات الدولية ضد الاسلام........................................ أم بنان

# بەندی دووەم

# تەبشیر

## ( بەمەسیحی کردن )

### پێشەکی:

بۆ مەبەستی زیاتر شارەزابوون و زانیاری وەرگرتن دەربارەی ڕێچکەو بیردۆزە دەست کردوو چەواشەکاریەکانی دنیای ئەمڕۆ زۆر بەپێویستم زانی کەلەبەندی دووەمی ئەم نامیلکەیەدا باسێکی ووردو لێکۆڵینەوەیەکی زانیاری و ژیرانە بکەم دەربارەی ڕێچکەی بەمەسیحی‌کردن ( تبشیر) تاخەڵکی بەگشتی و موسڵمانان بەتایبەتی لەشەوەزەنگی بێئاگایی بەخەبەر بێنەوەو بەچاوی خۆیان دوژمنی خۆیان ببینن.

بەڵێ مرۆڤ تادوژمنی خۆی نەناسێ ناتوانێت خۆی لێبپارێزێ و لەبەرامبەریدا بوەستێ، بەڕاستی دوژمنەکانی ئەمڕۆ زۆر لەدوژمنەکانی سەردەمی پێغەمبەر سەرسەخت ترو گومڕاکەرترن چونکە دوژمنانی ئەو سەردەمە بەئاشکرا بانگەشەی دوژمن کاری خۆیان دەکردوو سەرجەم موسڵمانان دەیان زانی کەئەوانە دوژمنن و دژی دین و بیروباوەڕی ئەمانن.

بەڵام دوژمنانی ئەمڕۆ بەشێوەیەکی‌تر دژایەتی موسڵمانان دەکەن و بەناوێکی ترەوە خەڵکی لەئیسلام دوردەخەنەوە، ئەویش بەوەی کەلەدنیای ئەمڕۆدا ئەو ڕێچکەو ڕێبازانەی کەدێنە سەر شانۆی ژیان و دروست دەبن ناوێك لەخۆیان دەنێن کەزۆر سەرنج ڕاکێشەربێت و بەڵگەبێت لەسەرچاکی و پاکی ئەو بەرنامەیە، بەڵام مەبەستی سەرەکی و هەرە گەورەشیان بریتیە لەگومڕاکردنی خەڵکی و دورخستنەوەیان لەخوای گەورە.سەرنج بدە (علمانیەکان) ووتیان زاراوەی (علمانیەت) لە (علم)ەوە هاتووە بۆ مەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی چینی ڕۆشنبیران و زانست خوازان بەلای خۆیاندا بەڵام مەبەستی سەرەکیان بریتی‌بو لەدارنینی ئیسلام لەدڵ و دەرونی خەڵکی.

هەروەها خاچ پەرستەکان بۆ مەبەستی گومڕاکردن و چەواشەکردن و بەمەسیحی‌کردنی خەڵکی ناوێکی زۆر ڕەونەق دارو بریقەداریان لەخۆیان نا کەئەویش

بریتیبوو لە(تەبشیر) بێگومان زاراوەی (تەبشیر) لە(بەشارەت)ەوە هاتووەو مانای (مژدەدان) دەگەیەنێ.

بەڵێ مژدەدانو دڵ خۆش کردنی خەڵکی، بەڵام ئایا لەڕاستیدا وایە؟! ئایا ئەم ڕێچکە دوور لەخوایە چ مژدەو چ خۆشیەك دەدات بەخەڵکی؟! بێگومان مژدەی ئەم بیردۆزە گومڕاکەرە تەنها ئەوەیە کەخەڵکی لەخوای گەورەو سەرچەم بەها ڕەوشتیەکان دوور دەخاتەوە.

کەواتە ووتنی ووشەی (تەبشیر) تەنها ناوێکە بۆمەبەستی گومڕاکردنو چەواشەکردنی خەڵکی بەکاردەهێنرێت، کەواتە بەپێی ئەم ڕوون کردنەوەیە ڕاستە وەهەریەکە بەم ڕێچکەیە بڵێین(تەنصیر) واتە (بەمەسیحیکردنو دورخستنەوەی خەڵکی لەبەرنامەی پاكو بەرزی ئیسلام))

## پێناسەی تەبشیر ( بەمەسیحیکردن )

((حركة دينية سياسية إستعمارية بدات بظهور اثر فشل الحروب الصليبية بغية نشر النصرانية بين الامم المختلفة في دول العالم الثالث بعامة وبين المسلمين بخاصة يهدف احكام السيطرة على هذة الشعوب)).[1]

واتە: بریتیە لەوجوولە ڕامیاریە نوێخوازیەی کەبەلەناوچوونی جەنگی خاچ پەرستەکان پەیدابوو، مەبەستی سەرەکی بریتیە لەبڵاوکردنەوەی مەسیحیەت بەناو گەلو میللەتە جیاوازەکانی دەوڵەتانی جیهانی سێهەمدا بەگشتیو نێوان موسڵمانان بەتایبەتی بۆمەستی دەست گرتن بەسەر ئەو گەلانەدا.

یان بەشێوەیەکیتر بڵێین: (تەبشیر) بریتیە لەو ڕێچکە خاچ پەرستەی کەمەبەستی سەرەکی بریتیە لە(بەمەسیحی) کردنی خەڵکی بەگشتیو موسڵمانان بەتایبەتیو ناشرین کردنی دینی ئیسلام لەبەرچاوی خەڵکیدا ئەوەیش بە دروست کردنوو هەڵبەستنی ڕوداوی درۆو قسەی بێناوەڕۆك بۆ ئیسلامو موسڵمانان، هەربۆیە کابرایەکی وەك (هاربن) دەڵێ:

---

(١) الموسوعة الميسرة في الاديان والمذاهب المعاصرة (ص: ١٥٧).

((ان محمداً كان في الحقيقة عابد اصنام.......)).[1]

واتە// (محمد) (ﷺ) لەڕاستیدا بت پەرست بووەو بەتاکو تەنها خوای نەپەرستووە.

نمونەی چەند بوختانو درۆیەکی جووڵەی تەبشیر بۆ ئیسلامو موسڵمانان

*وەك لەمەوپێش باسمان کرد کەمەبەستی سەرەکیو هەرەگەورەی جوڵەی (تەبشیر) بریتیە لەدروست کردنی درۆو پروپاگەندە بۆ ئیسلامو موسڵمانان، ئەویش بۆچەند مەبەستێکی دیاریکراو کەبریتین لە:*

أ) پچڕاندنو لاوازکردنی ئەو پەیوەندیەی کەلەنێوان بەندەو پەروەردگاریدایە.

ب) پچڕاندنو سڕینەوەی سەرجەم بەها ڕەوشتیەکانی ناو کۆمەڵگا، ئەویش بەدروست کردنو هاندانی بەدڕەوشتیو جوان کردنیان لەبەرچاوی خەڵکیدا.

ج) بۆ مەبەستی دورخستنەوەی موسڵمانان لەئیسلامو کردنیان بەمەسیحی.

بەڵێ هەر بۆ ئەم مەبەستە (تەبشیریەکان) لەشاری (قدس) لە (فەلەستین) کۆنگرەیەکیان بەستو سەرەك کۆنگرەکە، کەناوی (القیس زویمر) بوو بەسەرجەم ئامادەبوانی ئەو کۆنگرەی ووت.

((ان أهدافنا من التبشير ليست ادخال المسلمين في المسيحية، وانما مهمتكم ان تخرجو المسلم من الاسلام، ليصبح مخلوقا لاصلة له بالله وبالتالي فلاصلة تربطه الاخلاق التي تعتمد عليها الامم في حياتها))[2]

واتە: مەبەستی سەرەکی لەبەمەسیحی کردنی خەڵکیدا بریتینیە لەدەرکردنی موسڵمان لەئیسلامەوە بۆ مەسیحیەت، بەڵکو مەبەستی سەرەکیمان لەتەبشیر بریتیە لەدەرکردنی موسڵمان لەئیسلام، بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ خوادا بپچڕێت، هەروەها هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ ڕەوشتدا نەمێنێت، ئەو ڕەوشتەی کەبناغەی ژیانی هەموو گەلێکە.

کەواتە لەم ڕوانگەوە باشترین کار بۆ دورخستنەوەی موسڵمان لەئیسلام بریتیە لەڕەش کردنی ئیسلامو پێغەمبەرو مێژووی ئیسلامی، *هەربۆیە جوڵەی تەبشیر لەم ڕێگەیەی گرتەبەرو هەزارەها درۆو پروپاگەندەی ژەهراوی هەڵبەست بۆ ئیسلام کەبەرچاوترینیان ئەمانەن:*

---

(١) التبشير والإستعمار - عمر فروخ.

(٢) اخلاقنا او الدمار - ابراهيم نعمة (ص: ١٧).

١- (لطفى ليفونيان) كەيەكێكە لەئەندامانى (تەبشير) بەرەچەڵەك ئەرمەنيە دەڵێت ((ان التأريخ الاسلام كان سلسلة مخيفة من سفك الدماء والحروب والمذابح))

واتە: مێژووی ئیسلامی پێکهاتووە لەزنجیرەیەك ڕووداوی ترسناك هەر لەخوێن ڕشتن و جەنگ و سەربڕینی خەڵکی!!؟

٢- (نلسن) دەڵێ ئیسلام دینێکی لاسای کەرەوەیەو لەمەسیحیەتەوە وەرگێڕاوە؟!

٣- (جسب) كەيەكێکی ترە لەئەندامانی تەبشیر دەڵێت:

((ان الاسلام مبنى على الاحادث اكثر مماهو مبنى على القران، ولكننا اذا حذفنا الاحاديث الكاذبة لم يبق من الاسلام شين))

واتە: ئیسلام لەسەر بناغەی (حەدیث) دروست بووە بەزۆری نەك لەسەر ئایەتەکانی قورئان، خۆ ئەگەر هەڵسین بەلابردنی ئەو (حەدیثە) درۆیانە ئەوە ئیسلام هیچی نامێنێتەوە!!

٤- (القس صموئيل زويمر) كەكاسە لێسێکی خاچ پەرست و دوژمن بە ئیسلام دەڵێت:

((يجب اقناع المسلمين بأن النصارى ليسوا أعداءهم))[1]

واتە: پێویستە لەسەرمان کەموسڵمانان واڵێبکەین و تێیان بگەیەنین کەخاچ پەرستەکان (مەسیحیەکان) دوژمنیان نین.

هەروەها دەڵێ ((يجب نشر الكتاب المقدس بلغات المسلمين لانه اهم عمل مسيحى))

واتە: پێویستە لەسەرمان کەکتێبی پیرۆزی خۆمان (واتە ئینجیل) بەزمانی موسڵمانان بڵاوبکەینەوە چونکە ئەمە گەورەترین کاری مەسیحیەتە.

هەروەها لەجێگەیەکی تردا دەڵێت:

((ينبغى للمبشرين ان لايقنطوا اذا رأوا نتيجة تبشرهم ضعيفة اذ ان من المحقق ان المسلمين قد نما فى قلوبهم الميل الشديد الى علوم الاورو بيين وتحرير النساء)).

واتە: ئەو کەسانەی کەهەوڵ دەدەن بۆ مەبەستی بەمەسیحی‌کردنی خەڵکی بادڵ گران نەبن لەوەی کەئەنجامی بانگەوازیەکەیان بێبەرهەم و لاوازە، چونکە ئێمە بۆمان دەرکەوتوە کەموسڵمانەکان لەدڵەوە زۆرحەز بەزانستی ئەوروپا دەکەن و لەگەڵ ئازادی ئافرەتان. واتە: ڕووت و قوتیان

(١) ئەو چوار خاڵەی سەرەوە لە(الموسوعة الميسرة فى الاديان والمذاهب المعاصر) وەرگیراوە (ص: ٦٢)

سەرنج بدە خاچ پەرستەکان چ هەوڵو تێکۆشانو ماندوبونێك دەدەن لەپێناوی ناشیرین کردنو دروست کردنی ڕوداوی پیسو ترسناك بۆ ئیسلامو موسڵمانان، بەڕاستی ئەمڕۆ موسڵمانان بەرامبەر بەجوڵەی (تەبشیر) زۆر بێئاگاو بێخەبەرن لەکاتێکدا جوڵەی تەبشیر تەواو دەستی کێشاوە بەسەر وڵاتانی ئیسلامیداو بەردەوام کاری خۆیان دەکەنو کتێبو مەبەستەکانی خۆیان بڵاودەکەنەوە.

## ئەو ڕێگایانەی کەجوڵەی تەبشیر بەکاری دەهێنێت بۆ بەمەسیحی کردنی خەڵکی بەگشتیو موسڵمانان بەتایبەتی

وەك لەسەرتادا باسمان کرد کەزاراوەی (تەبشیر) ووشەیەکی گومراکەرە بۆ مەبەستی چەواشەکردنی خەڵکی بەکاردەهێنرێت هەر لەم ڕوانگەیەوە جوڵەی تەبشیر هەڵسان بەبەکارهێنانی چەند هۆکارو ڕێگەیەك بۆ مەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی خەڵکی بەگشتیو موسڵمانان بەتایبەتی.

بێگومان ئەو هۆکارانەی کەجوڵەی تەبشیر بەکاریان دەهێنێت بەڕوکەش زۆرلەخزمەتی مرۆڤایەتیدانو کەس ناتوانێت ئینکاری لەچاکیو باشی ئیشەکانیان بکات بەلام لەژێرەوە مەبەستێکی تریان هەیەو ئەو کارەی ئەنجامی دەدەن بۆ چەواشەکردنو ئاشناکردنی خەڵکیە بەبەرنامەی دەست کاری کراوو (منحرف) مەسیحیەتە، *هەر لەم پێناوەدا سەرەکیترین ئەو هۆکارانەی کەبەکاری دەهێنن بریتین لە:*

١- بواری پزیشکیو دروست کردنی نەخۆشخانە:

بێگومان هەموو کەس دەزانێ کەکاری پزیشکی پیشەیەکی خزمەت گوزاریەو خزمەت بەکۆمەڵگا دەکات، هەروەها ئەو کەسانەی کەلەبواری پزیشکەوانیدا کاردەکەن زۆر ڕێزدارنو خەڵکی بەپەڕی باوەڕەوە قسەیان لێوەردەگرێت هەربۆیە جوڵەی تەبشیر پیشەی پزیشکەوانیو کردنەوەی نەخۆشخانەی کردە سەرەکیترین کاری خۆیو دەیانو سەدان پزیشکی پەروەردەکرد بۆ ئەو نەخۆشخانانەی کەخۆیان مەبەستیان بوو بۆیان دەناردن، خەڵکیش بەچاوێکی زۆر ڕێزدارو بەرزەوە سەیری دەکردنو قسەکانیانی لێوەردەگرتن، هەربۆیە لەم کاتەدا ئەو پزیشکانە باشترین هەلیان بۆ ڕێدەکەوت بۆ مەبەستی گەیاندنی ئەو بیروباوەڕە هەڵەو چەوتەی کەوەك خاچ پەرستێك باوەڕیان پێهێنابوو بەگوێی نەخۆشەکاندا.

بێگومان نەخۆشیش لەو حاڵەتە ناخۆش و لاوازەی کەتێیدایە لەهەموو کات زیاتر پێویستی بەقسەی خۆش و یارمەتی (دکتۆر) هەیە، هەربۆیە لەم حاڵەتەدا ئەندامان و قوتابیانی قوتابخانە تەبشیریەکان بیروباوەڕی گەندەڵ و هەڵەی خۆیان وەك نیگایەك دەچرپان بەگوێی ئەو کەسە نەخۆشەداو لەئەنجامدا ئەو کەسە بەوپەڕی باوەڕەوە قسەکانی لەکابرای دکتۆر وەردەگرت و بەگوێی دەکرد.

(رشتر) کەیەکێکە لەقوتابیانی قوتابخانەی تەبشیر و یەکێە لەو کەسانەی کەلەبواری پزیشکیدا کاردەکات، بەسەرجەم پزیشکەکانیتر دەڵێت:

((ان الشیطان یرید ان نفتنکم فیقول لکم: ان واجبکم التطیب فقط لاالتبشیر))..واتە: شەیتان دەیەوێت توشی ئەوەتان بکات و لەدڵتانی بچەسپێنێ کەپێتان بڵێ ئیش و کاری ئێوە تەنها بریتیە لەچارەسەرکردنی نەخۆش نەك خەڵك بەمەسیحی کردن))!!

لەکۆتای قسەکانیدا ئامۆژگاریەك یان دەکات و دەڵێت ((فلا نسمع منه))[1]

واتە: ئەم قسەیە تەنها وەسوەسەی شەیتانەو گوێی لێمەگرن و بەقسەی مەکەن.

بەڕاستی ئەمڕۆ جوڵەی تەبشیر لەهەموو جیهاندا بڵاوبۆتەوەو لەهەر وڵاتێکیش شوێن پێی خۆیان بکەنەوە دەست بەجێ هەوڵ دەدەن بۆ دروست کردنی نەخۆش خانە چونکە باشترین هۆکارە بۆ بەمەسیحیکردنی خەڵکی.

### ٢- بواری فێرکردن و دروست کردنی خوێندنگا (فی مجال التعلیم):

یەکێکیتر لەو هۆکارانەی کەجوڵەی (تەبشیر) بەکاری دەهێنێ بۆ ((مەبەستی بەمەسیحی کردنی خەڵکی بەگشتی و چینی خوێندەوارو ڕۆشنبیران بەتایبەتی)) بریتیە لە کردنەوەو دروست کردن و بایەخ دان بەکردنەوەی خوێندنگاو لەچاپ دانی پەرتوك بۆ قوتابخانەکان و بڕیاردان لەسەر کردنەوەی خولی فێربوونی زمانە جیاوازەکان و نوێکردنەوەی زانکۆو پەیمانگاو سەرجەم بوارە فێرکاریەکانیتر، هەر لەقۆناغەکانی سەرەتایی تا زانکۆو پەیمانگاکان.

وەك لەوەو پێش باسمان کرد سەرەکیترین مەبەستیان لەخزمەت کردن و بایەخ دان بەبواری زانیاری فێرکردن تەنها بریتیە لە (بە مەسیحیکردنی خەڵکی، ئەویش بەهۆی بەکارهێنانی هۆکارێکی زۆر باش و دروستەوە کەبواری فێرکردن و زانست خوازیە.

---

(١) التبشیر والاستعمار – عمر فروخ.

بەڵێ هەربۆیە (هنری جسب) کەیەکێکە لەقوتابیانی (تەبشیر) دەڵێ: ((ان التعليم في (مدارس) الارساليات المسيحية انما هو واسطة الى غاية فقط، هذة الغاية هي قيادة الناس الى المسيح وتعليمهم حتى يصبحوا افرادا مسيحيين وشعوباً مسيحية)).[1]

واتە: کاری فێرکاری لەو قوتابخانەو خوێندن گایانەی کەمەسیحیە گاورەکانی تێدایەو بانگەوازبۆ (بەمەسیحی)کردنی فێرخوازان دەکەن تەنها بریتیە لەبەکارهێنانی هۆکارێك بۆ گەیشتن بەمەبەستی سەرەکی خۆمان کەبریتیە لەبەمەسیحیکردنی خەڵکی ، بێگومان ئەو مەبەستەشمان بریتیە لەگەیاندن و بڵاوکردنەوەی مەسیحیەت لەناویاندا هەتا وەکو چەند کەسانو گەلێك ی گاورو مەسیحی دەربچن!!

هەروەها دەڵێ: ((ان المدارس شرط أساسي لنجاح التبشير)).[2]

واتە: قوتابخانەکان مەرجی سەرەکیو بناغەن بۆ (بەمەسیحیکردن) بەڵێ ئەمە مەبەستی سەرەکی جوڵەی تەبشیرەو لەگەڵ ئەمەشدا مەبەستێکی تریان هەیە کەبریتیە لەپەروەردەکردنو پێگەیاندنی کۆمەڵێك قوتابی گاور لەووڵاتانی ئیسلامی بۆسودوەرگرتن لەداهاتوویانو ئاسان بەڕێوەبردنی کارەکانیان لەپاشەڕۆژدا.

## هۆکاری بڵاوبونەوەی جوڵەی (تەبشیر) لەووڵاتانی ئیسلامیدا

***بێگومان چەند هۆکارێکی سەرەکی بووە هۆی بڵاوبونەوەی جوڵەی تەبشیر بەمەسیحیکردن . لەووڵاتانی ئیسلامیدا کەسەرەکیترینن یان ئەمانەن:***

### ١ـ بێئاگاییو دووری موسڵمانان لەحەقیقەتی ئیسلام:

یەکێ لەهەرە ئەو هۆکارە سەرەکیو بەرچاوانەی کەبوە هۆی بڵاوبوونەوەی جوڵەی تەبشیر لەووڵاتانی ئیسلامی بریتیبوو لەبێئاگاییو نەشارەزایی موسڵمانان بەئیسلام، خوای گەورە ئیسلامی بە(ڕوح) واتە گیان تەشبیە کردووەو دەفەرمێت: ﴿وكذالك أوحينا إليك روحاً من أمرنا﴾ (الشورى: ٥٢).

واتە: ئەی محمد (ﷺ) ئێمە بەفەرمانی خۆمان (ڕوحت) بەشێوەی نیگا بۆ دەنێرین کەمەبەست پێی ئیسلامو قورئانە بەڵێ (ئیسلام) ڕوحەو تایبەت مەندێتی (ڕوحیش)

---

(١) التبشير والاستعمار (عمر فروخ)

(٢) هەمان سەرچاوە.

لەوەدایە کەبچێتە هەر لاشەیەکی مردووەوە زیندوی دەکاتەوە، بەڵام زۆر بەداخەوە موسڵمانان بەهۆی دورکەوتنەوەیان لەو (ڕوحە) کەئیسلامو قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەرە)) توشی دەیانو سەدان گرفتو کێشەی دینیو دنیای بوون.

لەوانە هەندێکیان بووە داردەستو بەکرێگیراوی بێباوەڕانو هەندێکیتریان بوونە ئالەتێکی چالاك بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشوکاری علمانیو مارکسیو گاورو جولەکەکانو هەندێکیتریان بونە چەك بەدەستو پاڵپشتی ستەم کارو فەرمان ڕەوا دور لەدینەکان.

بەڵێ گاورە مەسیحیەکانیش لەم دەرگایەوە سەیرێکی حاڵی شڕی موسڵمانانیان کردوو هاتنە ژورەوەو ئەوەی ویستیان بەرنامەیان بۆ داڕشتو پاشان جێبەجێیان کرد.

## ٢- دووەم هۆکار بۆ دروست بونو بڵاوبونەوەی جوڵەی (تەبشیر) لەووڵاتانی ئیسلامی بریتیبوو لەڕوخانو لەناوچوونی خەلافەتی عوسمانی:

ئەویش بەهۆی پلانەیەك لەدوا یەکەکانی جولەکەو سەرجەم دووژمنە ڕق لەدڵەکانیتر، بێگومان ڕوخانی خەلافەتی عوسمانی ڕێخۆش کەرێکی زۆر گەورەبوو بۆ بڵاوبونەوەو پەرەسەندنی جوڵەی تەبشیر لەووڵاتانی ئیسلامی، چونکە پێش ڕوخانو لەناوچونی خەلافەتی عوسمانی سەرجەم ڕێچکەو بیردۆزە ماددیو دینە (منحرف)ەکان بەشێوەیەکی نهێنی کاریان دەکردوو ژێر بەژێر چالاکیەکانی خۆیان ئەنجام دەدا بەشێوەی (تنظیم)ی نادیار، بەڵام لەپاش ڕوخانی خەلافەتی عوسمانی ئەو بەربەستە شکاو ڕێخۆش کەرێکی گەورەبوو بۆ جوڵەی تەبشیر کەچالاکیەکانی خۆیان لەووڵاتی ئیسلامیدا ئەنجام بدەنو خەڵکی لەئیسلام دووربخەنەوە.

٣- سێهەم هۆکار بۆ بڵاوبونەوەی ڕێچکەی (تەبشیر) لەووڵاتانی ئیسلامی بریتیبوو لەوەی کەلەووڵاتانی ڕۆژئاوا سەدانو هەزاران قوتابی گاوری خاچ پەرست پەروەردەکراو بەناوی خێر خوازو دەستەی فریاکەتنەوە ڕەوانەی ووڵاتانی ئیسلامی کرانو ئەوانیش زۆر بەئاسانی کاری سەرەکی خۆیان ئەنجام داو خەڵکێکی زۆر یان لەمووسڵمانو غەیری موسڵمان کردە قوتابی جوڵەی تەبشیر.

٤- دانانی ئابڵوقەی ئابوریو دروست کردنی شەڕی ناوخۆ لەووڵاتانی ئیسلامیدا:

بێگومان بەر چاوترینو سەرەکیترین هۆکار بۆ بڵاوبنەوەی (تەبشیر) لە ووڵاتانی ئیسلامی بریتیبوو لەم خاڵە بەم شێوەیە.

لای هەموو كەس ئاشكرایە كەسەقام گیربوون و جێگیربوونی ئاشتی لەووڵاتدا دەبێتە خۆش گوزەران و حەوانەی ئەو خەڵكە، هەروەها شەڕ و كوشتار دەبێتە هۆی كاول بوون و ڕوخانی بنەما ئابوری و كۆمەڵایەتی و سیاسیەكانی ووڵات، بەڵێ جوڵەی (تەبشیر) بۆ مەبەستی دورخستنەوەی خەڵكی لەئیسلام و ئاشناكردنیان بەڕێچكەی تەبشیر هەڵسان بەدروست كردنی جەنگ و دوبەرەكی لەنێوان لایەنە جیاوازو دژ بەیەكەكانی ووڵاتانی ئیسلامی تالەئەنجامدا كارگەیشتە ئەوەی كەووڵات وێران ببێت و هیچی بەسەر هیچەوە نەمێنێت.

بەڵێ لەم كاتەدا گەورەترین هەلە بۆ گەیشتنی یارمەتی و ئازوقەو دروست كردنی نەخۆش خانەو قوتابخانەو سەرجەم بوارە خزمەت گوزاریەكانی‌تر بەو ووڵاتە، هەر بۆیە بەم بیانوانەوە (تەبشیر) توانی لەهەموو ئەو ووڵاتانەی كەشەڕی ناوخۆی تێدا بوو بنكەی خۆی بەناوی ئاوادان كردنەوەو نوێكردنەوەی ووڵات و ژێرخانی ئابوریەوە دابمەزرێنێ و مەسیحیەت بەناو خەڵكی ئەو ووڵاتەدا بەئاسان ترین شێوە بڵاوبكاتەوە. كوردستانی خۆمان باشترین نمونەی زیندووەو لەبەرچاوە.

گەر بەخێرای سەیرێكی (١٠) ساڵ لەمەوپێش بكەین و بەراوردی بكەین لەگەڵ حاڵی ئەمڕۆی خۆماندا لەڕوی بڵاوبونەوەی (ئینجیل و كتێبە مەسیحیەكانی‌تر) جیاوازیەكی زۆر گەورە بەدی دەكەین چونكە (١٠) ساڵ لەمەوپێش زۆركەم لەخەڵكی ووڵاتی خۆمان دەیان زانی (ئینجیل) چیەو پەرتوكی چ گەل و میللەتێكەو تاچ ڕادەیەك بەڕاستی ماوەتەوە، خۆ گەر خواستی بەدەست خستن و خوێندنەوەی یەكێ لەو (ئینجیلانەت) بوایە ئەوە بەئاسانی دەستت نەدەكەوت و لەهەموو جێگەو شوێنێكدا نەدەبینرا.

بەڵام ئەمڕۆ لەووڵاتی ئێمەداو لەكوردستان بەتایبەتی (ئینجیل) بەهەر چوار جۆرەكەیەوە (لوقا، یوحنا، مرقص، متی) لەسەرجادەو شۆستەو هەندێ لەكتێبخانە گشتیەكاندا بەهەرزان ترین نرخ دەفرۆشرێ، یان لەهەندێك جێگادا بەدیاری دەدرێت بەخەڵكی، یان لەگەڵ شتی‌تردا بەیان درێتێ؟!

یان لەهەندێ لەو نەخۆش خانەو خوێندنگایانەی كەكردویانەتەوەو بەڕوكەش خزمەتی قاچ پەڕیوو كەم ئەندامو هەژارانی ووڵاتی تێدا دەكەن بەئاشكرا وەك ڕۆژی ڕوناك (ئینجیل) یان بەدیاری دەدرێتێ، كەلاپەڕەكانی لەماعەو ڕەسمەكانیشی ڕەنگاو ڕەنگ) لەهەندێ جێگاشدا ئەو ئینجیلانە كەدابەش دەكرێت كراوە بەكوردی بۆ مەبەستی ئاسان خوێندنەوەو تێگەیشتن لێی.

باشە ئەمە دەبێت بۆ وابێت؟! تۆ بڵێی خوای گەورە بەم کارە ڕازیبێت؟! باشە دەبێت ئێمەی ئیسلام خوازو دڵسۆزی ئیسلام حسابمان چیبێت لەڕۆژی دوایداو وەڵامی چی خوای گەورە بدەینەوە؟!

کەواتە ئەی موسڵمانی کورد!! ئاگاداربیبەرەو هۆشت بێتەوە بەخۆتداو علمانیو گاورو جەلەکەو کاسەلێس پاڵپشتەکانیان وولاتیان پڕکردین لە بێدینیو بەدکاری، کردیانە باشترین تاقیگە بۆ بەئەنجام گەیاندنی پیلانەکانیان ئافرەتانی حجابیان ڕوت کردینەوەو گەنجانو ڕۆڵە وولاتیان لەئیسلامو خوای گەورە دورخستنەوەو گومڕاو سەرلێشێواویان کردو پاشان کردیانە دژی ئیسلامو بەرنامەی قورئان.

سەروەتو سامانو کەلەپورو دارای وولاتیان بەتاڵان بردین بۆخۆیان، دەی ڕاپەڕنو ووریابینەوەو ببنە کەناڵێکی ڕاگەیاندنو بانگی حەق بدەین بەگوێی خەڵکیداو پەردە لەسەر ڕوخساری ڕەشو تاوانی دوژمنانی ئیسلام لابەرین.

بەڵێ ئابلۆقەی ئابوریو شەڕی ناوخۆ ئەنجامەکەی بەوە گەیشت کەلەوولاتێکدا ڕۆژی (٥) جار بانگی خواو یەکتاپەرستی بدرێت بەگوێی خەڵکیداو ساڵانە مانگی ڕەمەزانی تێدا بگیرێتو زەکاتی فەقیرانی تێدابدرێتو خەڵکەکەشی خۆی بەموسڵمان بزانێ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کارگەیشتە ئەوەی کەرێچکە بێدینو جولەکەکان بەئارەزوی خۆیان تاڕادەیەکی سەرکەوتوو خەڵکیان لەدین دورخستەوەو بەدڕەفتاریان لەوولاتدا بەرپاکردو بیرو باوەڕی ساختەکارو فشەڵی خۆیان بەسرنج کردە مێشکو دڵی خەڵکەوە بەلام لەگەڵ ئەم هەموو درۆو ساختەو هەوڵە بەردەوامەشیاندا نەیان توانی تاسەرخەڵکی چەواشەبکەنو فطرەتیان بەرەو کەلاوەی بێباوەڕیو دور لەخواییبەرن، سوپاس بۆ پەروەردگار ڕابوونو بوژاندنەوەو بانگەوازی ئیسلامی پڵنگ ئاسا لەسەنگەری ڕووبەڕووبونەوەدا ڕاوەستا دژی درۆو کارە چەواشەکانیانو لەئەنجامدا خەڵکی چەواشەو بێئاگا لەئیسلام ووریابونەوەو گەڕانەوە بۆ باوەشی فراوانو گەرمی ئیسلامو مزگەوتەکانیان ئاوەدان کردەوەو ئیسلامیان کردە بەرنامەی ژیانیان، هەروەها ئەو ئافرەتانە کەبەبیانو پێشکەوتوخوازیەوە بەرگی حجابیان لەبەر داڕنیبون بەئاگا هاتنەوەو گەڕانەوە سەر فطرەتی پاکی خۆیانو پۆشینی بەرگی حجابو بازاڕو شوێنە گشتیەکانیان بەسەرپۆشی پاکو دڵی پڕلە ئیمانەوە ڕازاندەوەو لەهەمان کاتیشدا بونە درکێکی جگەر بڕ بۆ دوژمنانیان، بەڵێ ئەمە حەقیقەتەو پێویستە زۆر بەئاشکرا باس بکرێت: ﴿الذين يبلغون رسالات الله يخشونه ولايخشون أحدا إلا الله﴾.

## حوكمی ئیسلام دەربارەی جوڵەی تەبشیر بەمەسیحیكردن

*پێم باشە لەكۆتا باسی ئەم بەندەدا حوكمی ئیسلام دەربارەی (تەبشیر)و شوێن كەوتوانیان ڕوون بكەمەوە تا موسڵمانان زیاتر ئاشنابن بەیاساكانی ئیسلامو دوژمنی خۆیان بۆ دەربكەوێت.*

١- مەسیحیەت لەڕوانگەی ئیسلامەوە:

بێگومان دینی مەسیحیەت بەودینە دەوترێت كەبۆ گەلی جولەكە . بەنی ئیسرائیل . نێردراو(عیسی كوڕی مەریەم) بو بەپێغەمبەریانو پەرتوكێكی ئاسمانیان لەلایەن خوای گەورەوە پێ‌خەلأت كرا بەناوی (ئینجیل) هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وآتیناه الانجیل فیه هدی ونور﴾ (المائدة: ٤٦).

واتە: ئێمە ئینجیلمان بەخشی بە(عیسی) كەتێیدا بوو هیدایەتو ڕووناكی، بێگومان (عیسی) (علیه السلام) دوا پێغەمبەربوو بۆ جولەكەكان، هەروەها لەسەردەمی (عیساشدا) (ئینجیل) كۆنەكرایەوە لەیەك بەرگدا بەڵكو لەپاش (عیسی) هاوەڵەكانی هەڵسان بەنوسینەوەی (ئینجیل) بەلأم بەو شێوەنا كەلەكاتی خۆیدا هاتبوە خوارەوە بۆ (عیسا) (علیه السلام) بەڵكو زۆرێك لە ووتەی خوای گەورەیان وون كردوو گۆڕییانو قسەی خۆیان لە جێگەكەیدا دانا، لە پاشان دا ژمارەی ئینجیلەكەیان گەیشتە ڕێژەیەكی زۆر كە نزیكەی (١٠٠) انجیل دەبوو. گاورەكان هەڵسان بە سووتاندنی ئەو كۆمەڵە زۆرە ئینجیلەی كە بە دەست نوسی قەشەكان نوسرابوونو لەناویان بردن تەنها (٤) یان نەبێت كە ئێستا لە جیهاندا مەسیحیەكان زۆر متمانەی پێدەكەن كە بریتی‌یە لە:

*١- ئینجیلی لوقا.*
*٢- ئینجیلی یوحنا.*
*٣- ئینجیلی مرقص.*
*٤- ئینجیلی متی.*

هەریەك لەم ئینجیلانەی كە ئێستا هەن دژایەتیان لەگەڵ یەكتردا هەیەو جیاوازی‌یەكی گەورەو بەرچاو بەدی دەكرێت لە نێوانیاندا.

كەواتە: ئێمەی موسڵمان باوەڕمان بە ئینجیل هەیە وەك پەرتوكێكی ئاسمانی .. كە ووتەی خوای گەورەیە، بەلأم بە هیچ شێوەیەك باوەڕمان بەو ئینجیلە نیە كە لە جیهاندا هەیە چونكە دەست كاری كراوەو قسەی مرۆڤاكانی تێكەڵ بووە.

هەروەها دەربارەی مەسیحیەتیش دەڵێین:

هەروەك چۆن باوەڕمان وایە كە (ئینجیل) پەرتوكێكی خوایەو پاشان لە لایەن قەشەو گاورەكانەوە دەست كاری كراوە ئاواش باوەڕمان وا یە كە مەسیحیەت دینێكی خوایی بوو كە بۆ گەلی بەدكاری جولەكە هات و پاشان كە ئیسلام هات دینی مەسیحیەت سڕایەوەو كاری نەما، وە بە هاتنی ئیسلام سەرجەم دینە ئاسمانی یەكان (نەسخ بوونەوەو باویان نەما).

كەواتە ئێستا دەڵێین: مەسیحیەت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە دینێكە سڕاوەتەوەو بە هیچ جۆرێك دروست نیە كە ئیش بەیاساكانی بكەین و شوێنی بكەوین، هەروەها (ئینجیل) یش لە ڕوانگەی ئیسلامەوە كتێبێكی ئاسمانیەو بە هاتنی قورئان سڕاوەتەوەو كاری پێ ناكرێ، هەروەها ئینجیل لەگەڵ ئەوەی كاری پێ ناكرێت، دەست كاریش كراوەو هەزاران قسەی مرۆڤی بەناوی خواو عیساوە تێدا وتراوە، بەڵێ:

*كەواتە ئێستا نە دروستە ببیت بەمەسیحی چونكە بە هاتنی ئیسلام.. سڕاوەتەوە، نەدروستە ئینجیل بكەیتە بەرنامەو پێشەنگی ژیانت چونكە:*

ا) بە هاتنی قورئان ئینجیل و سەرجەم كتێبە ئاسمانی یەكانی تر سڕانەوەو كاریان نەما.

ب) ئینجیل دەست كاری كراوەو پڕیەتی لە قسەی پاپاو قەشە گاورەكان.

## ٢- حەرەكەی تەبشیر لە ڕوانگەی ئیسلامەوە:

*هەروەها حوكم ی ئیسلام دەربارەی حەرەكەی تەبشیر ئا بەم جۆرەیە:*

بێگومان حەرەكەی (تەبشیر) ڕێچكەیەكی گومڕاكەرەو هەوڵ دەدات لە پێناوی دورخستنەوەی خەڵكی لە ئیسلام و سەرجەم بەها ڕەوشتیەكان بۆ مەبەستی (بەمەسیحی) كردنیان، هەروەها حەرەكەی (تەبشیر) ڕاستەوخۆ لە دژی ئیسلام و موسڵمانان دروست بووەو بەردەوام كاردەكات بۆ دژایەتی ئیسلام و موسڵمانان.

كەواتە هەركەسێ شوێن ئەم ڕێچكە نادروست و بەدكارە بكەوێت و -واز لە ئیسلام بهێنێت - ئەوە ئیسلام بەیەكێ لە هەڵگەڕاوەكانی دەزانێ (مرتد) و حوكمی هەڵگەڕاوەكانیش لە دنیادا كوشتنە، هەروەك چۆن (ابو بكری صدیق) (خوای لێ ڕازی بێت) لەپاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) لەشكری بۆ ئامادە كردن و لەناوی بردن كە ئەو شەڕە ناونرا شەڕی هەڵگەڕاوەكان (حروب الردة).

هەروەها لە دوارۆژیشدا یەكێ دەبێ لەوكەسانەی كە ڕوخساریان ڕەش داگیرساوەو لە ڕەحم و لێخۆشبونی خوای گەورە وەدوورن، قورئان لە بارەیانەوە دەفەرموێت:

﴿فأما الذين أسودت و جوههم اكفرتم بعد ايمانكم؟!﴾.

واتە: ئەو كەسانەی كە باوەڕیان هەبووەو پاش باوەڕ هێنانەكەیان بێباوەڕ بونەتەوەو لە ئیمان پاش گەز بوونەتەوە لە دلرۆژدا ڕویان ڕەشەو ناشیرین ڕەخسارن.

# سەرچاوەکان


التبشير والأستعمار في البلاد العربي .............................. عمر فروخ

الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب المعاصرة.................. ندوة العالمي

اخلاقنا أو الدمار.................................................. ابراهيم نعمة

هل الكتاب المقدس كلام الله ...................................... أحمد ديدات

الإسلام في أفريقا الوسطى ........................................ ابراهيم نعمة

# بەندی سێهەم

## البوذية
## ( بوزیەت )

### پێناسەی بوزیەت:

بریتی‌یە لەو دینەی کە لە هندستان پەیدا بوو، مێژووی سەرهەڵدانی ئەم دینە دەگەڕێتەوە بۆ (٥٠٠) ساڵ پێش زاین، بەرنامەو یاساکانی ئەم دینە لەسەرەتای سەرهەڵدانو دروست بوونیدا خەڵکی بانگ دەکرد بۆ کەنارگیری‌و وازهێنان لە ژیانی دنیاو خۆشەویستی‌و لێبوردنو کاری چاك، بەڵام پاش مردنو لەناوچونی دامەزرێنەری ئەم دینە کە ناوی (بوذا) بوو شوێن کەوتوانی ئەم دینە هەڵسان بە گۆڕینو ڕۆچون لەم دینەداو چەند بیروباوەڕێکی بێناوەرۆكو بێواتایان خزاندە ناو دینی بوذیەتەوە تاکار گەیشتە ئەوەی کە (بوذا) بە خوا بزاننو کڕنوشی بۆ ببەن، هەروەها ئەم گەلە بەدکارو دوور لە خوایە هەڵسبان بە دروست کردنی پەیکەری (بوذا) و پاشان کڕنوشیان بۆ برد.

تێبینی: خوێنەری بەڕێز ئاگادار دەکەمەوە کە بۆ مەبەستی زیاتر شارەزا بوون لە پێناسەی (بوذیەت) با سەر بدەن لە کتێبی (الموسوعة المسيرة في الأديان والمذاهب المعاصرة) (ص: ١٠٧) یان (الموجز في الأديان والمذاهب المعاصرة) (ص: ٨٦).

## چەند هەڵویستو بیروباوەڕێکی بوذیەکان

بێگومان بوذیەت وەك ڕێچکەیەکی دروست کراوو دینێکی بێناوەرۆك چەند هەڵویستو بیروباوەڕێکی تایبەتی خۆیان هەیەو بەرچاوترینو سەرەکی ترینیان ئەمانەن:

### ١- بیروباوەڕی بوذیەکان دەربارەی پەروەردگارو خوایەتی:

بوذیەکان لەسەرەتای بانگەوازی دروست بونیاندا هیچیان نەدەوت دەربارەی خوای گەورەو وەك شتێکی نادیار (غیب) سەیریان دەکرد بەڵام پاش مردنو تیاچوونی

(بوذا)[1] هەندێ لە شوێن کەوتوانی دەستیان کرد بە پەرستن و کڕنوش بردن بۆ پەیکەری بوذا، هەندێکی تریان دەیان ووت (بوذا) کوڕی خوایە ((سبحانه وتعالى عما يشركون)) هەندێکی تریشیان انکاریبوونی خوای گەورەیان دەکردوو خەڵکیان بانگ دەکرد بۆ بێباوەڕی.

## ٢- هەڵوێستی بوذیەکان دەربارەی پاداشتی ڕۆژی دوایی:

(بوذیەکان باوەڕیان وایە کە مرۆڤ لە دنیادا چەندە باش بێت یان چەندە خراپ بێت ئەوە تەنها بۆ خۆی باشە یان خراپەو لە ڕۆژی دواییدا پاداشتو تۆڵەی لێ ناسێنریتەوە هەروەها باوەڕیان بە زیندوو بوونەوەو بەهەشتو دۆزەخو سزاو پاداشتی ڕۆژی دوای نیە).

گومانیشی تێدا نیە هەرکەسو کۆمەڵێك لە دنیا گەر انکاری یەکێ لە بنەما سەرەکیەکانی ئیسلامو ایمانی کرد (کافر) دەبێت، خوای گەورەش لەم بارەیەوە دەفەرموویێت:

﴿زعم الذين كفروا أن لن يبعثوا قل بلى وربي لتبعثن ثم لتنبئون بما عملتم وذلك على الله يسير﴾ (التغابن: ٧).

واتە: بێباوەڕەکان وادەزانن کە زیندوو ناکرێنەوە؟! ئەی محمد (ﷺ) بڵێ نەخێر پەروەردگارم زیندویان دەکاتەوەو پاشان پێشیان دەوترێت ئەوەی کە کردوویانە -لە هەموو ئەو خراپەو تاوانانەی کە ئەنجامیان داوە- بەڕاستی ئەمە کارێکە بەلای خوای گەورەوە زۆر ئاسانە.

## ٣- بیروباوەڕی بوذیەکان دەربارەی (ڕۆح) واتە (گیان):

بوذیەکان باوەڕیان وایە کاتێ یە کێ دەمرێو ڕۆحی دەردەچێ، ئەم ڕۆحەی دەچێتە ناو لاشەی کەسێکەوە کە تازە هاتبێتە دنیاوەو لەدایك بووبێت، پاشان ئەو ڕۆحەی کە لەلاشەی مرۆڤەکان دەڕوات دەچێتەوە لاشەی کەسانی ترو ئاوا بەو شێوەیە ڕۆحەکان لە نێوان خەڵکیدا دەگوێزرێنەوە، بەڵێ ئەم باوەڕە بێ ناوەرۆكو فشەڵەشیان لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە باوەڕیان بە زیندوو بوونەوەوبەهەشت و دۆزەخو پاداشتو سزا نیە.

---

[1] لە ڕاستیدا (بوذا) خۆی ناوی ((سدهارتا جوتاما)) یە و ووشەی بوزا لە قەبێکە بۆ ئەو کابرایە بەکار دەهێنرێت، کە (بوذا) بە مانای ((العالم)) واتە: زانا دێت، وەهەروەها نازناوی ((بسکیامونی)) شی لێنراوە کە بەواتای (مانەوە لە خەڵوەتدا)) (معتکف) دێت سەرچاوە. الموسوعة السيرة في الأديان والمذاهب المعاصرة (ص: ١٠٧).

بێگومان ئەم بروباوەڕەیان دەربارەی ڕۆح زۆر هەڵەیەو دژی فەرموودەی خوای گەورەو پێغەمبەر (ﷺ) چونکە مرۆڤ کاتێ دەمرێت ئەو ڕۆحەی بەرەو جیهانی (بەرزەخ) دەڕوات، ئەگەر ڕۆحێکی پاك بووبێت لە دنیاداو خوا پەرست بووبێت ئەوە تا ڕۆژی قیامەت لە خۆشیو حەوانەوەدا دەژی، خۆ ئەگەر ڕۆحێکی پیسو دوور لە خواو تاوان باریش بووبێت ئەوە تا ڕۆژی قیامەت لە ئەشکەنجەو ئازاردا دەبێت.

٤- بیروباوەڕی بوذیەکان دەربارەی یاسا چینایەتیەکان (النظام الطبقات):

(بوذیەکان بەو پەڕی توندو تیژیەوە بەرەنگاری یاسا چینایەتیەکان دەبنەوەو دژی دەوەستن، بوذیەکان دەڵێن: دەبێت هەمو خەڵکی وەکو یەك بژیو کەس لەکەس زیاتری نەبێتو هەموو خەڵك یەك جۆر جل لەبەربکەنو یەك خواردن بخۆنو یەك ماندوێتی ببینن و یەك جۆر ئەرکیان بەسەردا بدرێت ویەك جۆر ژیانیان هەبێت بەڤە دەر یەکتری پارەیان هەبێت؟!

ئایا ئەم یەکسانیەی ئەمان داوای دەکەن لەگەڵ فطرەتو دەروونی مرۆڤەکاندا دەگونجێ یان دژایەتی هەیە؟! لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم بیروباوەڕەیان لەگەڵ ڕەوشتو ناخی انساندا دژایەتیەکی گەورەی هەیەو هەرگیز لە جیهانی واقعدا جێبەجێ ناکرێت، بەڵگەشمان لەسەر ئەم ڕایە (مێژووی ٧٠ ساڵەی مارکسیەکانی یەکیەتی سۆڤیەتە) کە شیوعیەکان هەمان باوەڕیان هەبوو دەیان ووت دەبێت مرۆڤەکان لە کارو مافدا یەکسان بن بەڵام سەرەنجام شیوعیەت بەرهەمی فکری (٧٠) ساڵەی گەیشت بەڕوخانو ڕسوا بوون لەجیهانداو لای کەس بایەخی نەما، چونکە ئەوەی (بوذیەکان) لەکۆنداو (مارکسی) یەکان لەم سەردەمەدا خەڵکیان بۆ بانگ دەکرد لەگەڵ ویستو فطرەتو خۆزگەی خەڵکیدا نەدەگونجا، بەڵێ: خوای گەورە مرۆڤەکانی بە شێوەیەك دروست کردوە کە لەگوفتارو کردارو شتە ناوکیو سروشتیەکاندا جیاوازن بۆ مەبەستی ئازادی بیرکردنەوەو هەڵبژاردنی ئەو شتەی کە مرۆڤەکان خۆیان پێیان خۆشە نەك خەڵکانی غەیری خۆیان، هەروەها لە دنیادا ئەوەی زیاتر هەوڵ بداتو ماندو ببێت ئەوە مافی خۆیەتی ئەو کەسە دەوڵەمەندترو خاوەن دارایی تر بێت کە هەوڵ ناداتو ماندو نابێت.

قورئانیش لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

﴿والله فضل بعضكم على بعض في الرزق﴾ (النحل:٧١).

واتە: پەروەردگار فەضلی هەندێکی تری داوە بەسەر هەندێکی تردا لە بواری ڕزقو ڕۆزیدا.

٥- بیروباوەڕی بوذیەکان دەربارەی کارکردنو هەوڵ دان:

(بوذیەکان بە هۆی هەڵبژاردنی ژیانی کەنارگیرو دوور لە خەڵکیو ولازهێنان لە دنیاو خۆشیەکانی توشی گەورەترین ڕۆچونو هەڵە بوون کە بریتییە لە دەست پان کردنەوەو داواکردنی یارمەتیو کۆمەك لە خەڵکی، ئەمیش بەهۆی تەمەڵیو بێتوانای کارکردنو هەوڵ دانیان، بێگومان ئەم بیروباوەڕەشیان دژایەتی گەورەی هەیە لەگەڵ فطرەتی ئینسانەکانداو پاشان لەگەڵ یاسا نەگۆڕو بڕیار لەسەر دراوەکانی خوای پەروەردگاردا، چونکە مرۆڤ بێکارکردنو هەوڵ دان ناتوانێت بژێتو ژیانی بەردەوام بەسەر بەرێت، بەڵێ خوای گەورەو پێغەمبەریش داوای کارکردنیان لێ کردووینو هانمان دەدەن کە بەرەنجی شانی خۆمان کار بکەینو ژیانی ڕۆژانەی خۆمان دابین بکەین.

## تیشکێك لەسەر عەقیدەی بەدکاری بوذیەکان

*بێگومان بوذیەکان جگە لەو چەند خاڵەی کەلەوەوپێش باسمان کرد چەند بیروباوەڕێکی سەیرو بێ ناوەرۆکی تریان هەیە کەبە هۆیەوە توشی (شركو کوفرو ڕۆچون) بوون کە بەرچاوترینو سەرەکی ترینیان بریتییە لە:*

١- بوذیەکان باوەڕیان وایە کە (بوذا) خوایە (والعیاذ بالله).

٢- بوذیەکان دەڵێن: کاتێ (بوذا) لەدایك بوو سەرجەم سەربازەکانی ئاسمان ئاشنا بوونو مەلائیکەتەکان دەستیان بە ووتنی گۆرانیو نەشیدکرد لە تاو خۆشەویستی لەدایك بوونی (بوذا).

٣- شوێن کەوتووەکانی(بوذا) دەڵێن: کاتی بوذا مرد کاری گرنگی لەسەر زەوی تەواوکردو سەرکەوت بۆ ئاسمانەکان؟!

٤- بوذیەکان باوەڕیان وایە کە (بوذا) جارێکی تر دەگەڕێتەوە سەر زەوی بۆ مەبەستی سەقام گیرکردنو بڵاوکردنەوەی ئاشتیو برایەتی لە نێوان خەڵکی سەر زەویدا!!؟

*<u>پرسیار</u>/ ئایا بوذیەکان چەند کۆمەڵ و مەذهەبن؟!*

<u>وەڵام</u> / بێگومان بوذیەکان لە ناو خۆیاندا دوو کۆمەڵو دوو مەزهەبن کە بریتین لە:

١- کۆمەڵێکیان زۆر پەیوەستن بە سەرجەم یاساکانی دینی بوذاوە وە سیەتەکانییەوە.

٢- کۆمەڵی دووەمیان پێیان دەوترێت (المتدنیون):

ئەم کۆمەڵەیان لە کۆمەڵی یەکەمیان ناکاتو شل گیرن لە یاساو وەسیەتەکانی (بوذا) و لە هەندێ کاتو حاڵەتدا کەم تەرخەمی لە جێبەجێکردنیدا دەکەن.

## هەروەها بوذیەکان دوو ( مەزهەبی ) سەرەکیشیان هەیە کە بریتین لە ؛

( ۱ ) مەزهـــەبی شمـــالی: شـوێن کـەوتوانی ئـەم مەذهەبـە زۆر ڕۆچـون لـە خۆشەویستی و بەگەورەدانانی بوذا تا ئەو پلەیەی کە بە خوای دەزانن!!

( ۲ ) مەزهەبی جنوبی: شوێن کەوتوانی ئەم مەذهەبە وەك کۆمەڵی یەکەم نین و خۆشەویستیان بۆ (بوذا) کەم ترەو بە خوای نازانن!!

## شوێن و وولاتی بوذیەکان لە جیهاندا

بوذیەکان لە جیهاندا بڵاوبونەتەوەو بەتایبەتی لە ناو گەلانی ئاسیادا، وە زۆرترین شوین کەوتوی ئەم ڕێچکەیە بریتی‌یە لە وولاتانی:

((هیندستان، صین، یابان، نیبال، سیلان، بورما، کوریـا، ئەندۆنیسـیا، مـەنغۆلیا، کەمبۆدیا، تایلاندو چەند وولاتێکی تری جیهان)).

## حوکمی ئیسلام دەربارەی بوذاو بوذیەکان

هـەروەك چـۆن لـە بـەندی یەکـەم دووەمـی ئـەم نامیلکەیـەدا حوکمـی ئیســلاممان دەربارەی هەر دوو بیردۆزو ڕێچکەی (علمانیەت و تەبشیر) خستە ڕوو، ئاواش بەم جۆرە حەز دەکـەم حوکمـی ئیسـلام دەربـارەی ڕێچکـەی بوذیـەت و بوذیـەکان بخەمـە ڕوو بـۆ مەبەسـتی هۆشـیاربوونەوەو وریـا بوونـەوەی موسـڵمانان دەربـارەی ئـەم ڕێچکـە بـت پەرستە.

### ۱- حوکمی ئیسلام دەربارەی بونیەت:

قورئان فێری یاسایەکی نەگۆڕمان دەکات و پێمان دەڵێت:

((هـەر بیروباوەڕو بـیردۆزو دینێـك سـەرچاوەکەی نەگەڕایـەوە سـەر ووتـەی خـوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ئەوە ئەو بیروباوەڕو دینە دەبێتە ڕێچکەیەکی جاهلی و گومڕاکەر.

*کەواتە ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە ڕێچکەی بوذیەت بەکێشانەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کێشانە بکەین ئەوە لە ئەنجام دا دەگەینە ئەم چەند حوکم و بڕیارە:*

أ) بوذیـەت گـەر دینیش بێت و خـەڵکی بۆ یـەکتا پەرستی و ناسـینی خـوای گـەورە بانگ بکات ئەوە بە هاتنی دینی ئیسلام نەسخ دەبێتەوەو کاری نامێنێ چونکە ئیسلام

دینی کۆتاییەو بۆ سەرجەم خەڵکی سەر زەوی بەبێ جیاوازی.

کەواتە بەپێی ئەم یاسایە بوذیەت کاری نەماوەو دروست نیە کە خەڵکی شوێنی بکەون چونکە لە دینی بوذیەت زۆر باشتر هەیە کە ئیسلامەو سەرجەم لایەنە جۆراو جۆرەکانی ژیانی مرۆڤی گرتۆتەوەو لە هەموو کات و سەردەمێکدا یاساکانی جێبەجێ دەکرێت.

ب) بە پێناسە کردن و لێ کۆڵینەوە دەربارەی بوذیەت ئەو ڕاستیەمان بۆ دەرکەوت کە (بوذیەت) دین نیەو خوای گەورە نەی ناردووە، هەروەها (بوذا) ش کەسێکی هەڵبژاردەی خوا نەبووە لە ناو بەندەکانداو پێغەمبەر نەبووە، بەڵێ ج (بوذا) ج (یاساکانی بەرنامەی بوذیەت) لەلایەن خوای گەورەوە نەهاتووە، بەڵکو (بوذیەت) ڕێچکەیەکی دروست کراوی دەستی مرۆڤەکانەو بە ئارەزوی‌خۆیان یاساو بەرنامەیان بۆ داناوە.

کەواتە بە هیچ جۆرێك ئیسلام ڕازی نیە بە بوونی ئەم ڕێچکە بت پەرست و گومڕاچیە، بەڵکو ئیسلام بە بیرو باوەڕێکی جاهلی دەزانێ و شوێن کەوتوانیشی بە گومڕا سەیر دەکات.

## ٢- حوکمی ئیسلام دەربارەی شوێن کەوتوانی بوذیەت:

حوکمی ئیسلام دەربارەی بوذیەکان: سەرجەم زانایان ڕایان لەسەر ئەوەیە کە ئەگەر هەرکەسێ انکاری لە یەکێ لە یاساکانی ئیسلام کردو وتی ئەو حەرامە حەڵاڵە یان فلانە شت نەدەبوو وابوایەو دەبو ئاوا بوایە یان انکاری لە بنەما عەقیدیەکان بکات ئەوە بێگومان ئەو کەسە لە ئیسلام دەچێتە دەرەوەو بێ باوەڕ دەبێت، کەواتە ئێستا حوکمی ئیسلام دەربارەی بوذیەکان ئا بەم جۆرەیە:

أ) بوذیەکان مشرکن چونکە کڕنوش بۆ پەیکەری بوذا دەبەن هەروەك چۆن لەسەرەتادا مشرکەکانی مەککە کڕنوشیان بۆ (هبل و لات و عوزاو منات) دەبرد، خوای گەورەش لە (شرك) خۆش نابێت بە هیچ شێوەیەك وەك دەفەرموویێت:

﴿ان الله لا يغفر أن يشرك به ويغفر مادون ذلك لمن يشاء﴾.

واتە: خوای گەورە هەرگیز لە تاوانی شرك خۆش نابێت و لە گوناهەکانی تری غەیری شرك خۆش دەبێت گەر ئارەزوی لێبێت؟

ب) بوذیەکان بێ باوەڕن (کافر) چونکە انکاری زیندوو بوونەوەو حساب و بەهەشت و دۆزەخ دەکەن، هەروەك لەسەرەتادا باسێکی بیروباوەڕو بەرنامەیانمان نوسی.

ج) بوذیەکان گومڕان چونکە ڕێی ڕاستیان وون کردووەو تا ئێستاش کڕنوش بۆ بت دەبەن و خوای گەورەیان وون کردووە.

د) بوذیەکان کۆنەپەرستن چونکە هەمان کاری گەلەکەی (ابراهیم و نوح و موسا و عیسا و پێغەمبەر) دەکەن و کڕنوش بۆ بت دەبەن، بەڕاستی هەر پێغەمبەرێك بۆ هەر گەلێك ڕەوانە کرابێت دەست بە جێ باسێکی چڕ و پڕی عەقیدەو یەکتا پەرستی و یەك خواناسی بۆ خەڵکی کردووە تا خەڵکی لە بت پەرستی و چڵکاوی نەفامی دەربهێنن و لەو کۆنەپەرستی و گومڕاییە ڕزگاریان بکەن.

هـ) بوذیەکان ستەم کار (ظالم)ن. چونکە سیفەتی خوای گەورەیان داوەتە پەیکەرێك کە بەدەستی خۆیان دروست یان کردووە، بێ گومان بە هۆی ئەم کارەشیانەوە مشرك بوون خوای گەورەش لەسەر زمانی لوقمانەوە کاتێ ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات دەفەرمووێت: ﴿یا بني لا تشرك بالله ان الشرك لظلم عظیم﴾..واتە: ئەی کوڕی شیرینم هاوەڵ بۆ خوای گەورە پەیدا مەکە چونکە هاوەڵ دانان بۆ خوای گەورە ستەمێکی زۆر گەورەیە.

## دوا ووتەو دوا ئامۆژگاری

لە کۆتاباسی ئەم نامیلەیەدا حەز دەکەم دوا ووتەی خۆم پێشکەش بە خوێنەرانی ئازیز بکەم و وەك برایەکی دڵسۆز پێ‌ی بڵێم:

((خوێنەری بەڕێز ئەمەی باسمان کرد توێژینەوەیەکی زانستی و حەقیقی بوو دەربارەی هەرسێ ڕێچکەی (عیلمانیەت و تەبشیر و بوذیەت) کە مەبەستی سەرەکی هەریەك لەم سێ ڕێچکەیە بریتی‌یە لە سڕاند نەوەی بیری یەکتا پەرستی و یەك خواناسی لە دڵی مرۆڤەکانداو داڕنینی سەرجەم بەها ڕەوشتیەکان، بەڵێ تێگەیشتین لەم ڕێچکانە مرۆڤ ئاگاداری و هۆشـەندر دەکات بە ژیانی دنیاو ناسینی دۆست و دوژمنی خۆی.

لە کۆتایدا ئامۆژگاریم بۆ تۆی بەڕێز ئەوەیە کە تەنها شوێن ڕێبازی بەرزی ئیسلام بکەوەو تەنها پەروەردگار بە خوای خۆت بزانەو تەنها پێغەمبەر (ﷺ) بەڕابەر و پێشەنگی کاروانی ژیانت بزانەو گەر تا ئێستاش ئیسلام و ڕێگەی ڕاستت نەناسیوە ئەوە ئێستا بیناسەو لێ‌ی تێ بگە.

((ذاق طعم الأیمان من رضي بالله رباً وبمحمد رسولاً وبالأسلام دیناً)) (رواەمسلم)

واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمین.

تم بحمد الله اللطیف الخبیر.

١ / ٦ / ١٩٩٨ ز

٦ / صفر/ ١٤١٨ ك

# ناوەڕۆك

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

## بەندی دووەم



## بەندی سێیەم

# لەم کتێبەدا

❁ بەندی یەکەمی ئەم کتێبە دەدوێ دەربارەی بیردۆزی علمانیەت و ئەم بابەتانەی خوارەوە ...

- پێناسەی ووشەی (علمانی )
- هۆکاری سەرهەڵدانی علمانی لەوڵاتانی ڕۆژئاوادا .
- بیروباوەڕی علمانیەکان لەوڵاتانی ڕۆژئاوادا .
- کاریگەری باوەڕی علمانیەکان لەسەر تاك و کۆمەڵی خەڵکی ڕۆژئاوا.
- هۆکاری سەرهەڵدانی علمانیەت لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی.
- بیروباوەڕی علمانیەکان لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی.
- چەند بەڵگەیەکی واقعی و ژیرانە لەسەر فەشەلی بیرۆکەی علمانیەت لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا .
- حوکمی ئیسلام دەربارەی ڕێچکەی گومڕاکەری علمانی و شوێن کەوتوانیان .

❁ بەندی دووەم دەدوێ دەربارەی جوڵەی بەمەسیحی کردنی خەڵکی کە بە ( التبشیر ) ناسراوە ، ئەمیش چەندین باس و بابەتی گرنگ و جۆراو جۆری لە خۆ گرتووە هەر لە پێناسەی ( تبشیر ) و کاتی دروست بوون و ئامانج و ڕێگەکانیان بۆیە مەسیحی کردنی خەڵکی و چەندین بابەتی تر.

❁ کۆتا بەندی ئەم کتێبە کە بەندی سێهەمیەتی دەدوێ دەربارەی ڕێچگەی ( بوزیەت ) و ناوی دامەزرێنەری و بیروباوەڕو چەند باسێکی تر .

ژمارەی سپاردن (      )ی پێ دراوە ساڵی ١٩٩٩زایینی